ناوی کتێب: شۆڕش و توانای بەرپاکردنی شۆڕش
وەرگێڕانی: هەڵکەوت عەبدوڵڵا
بابەت: لێکۆڵینەوە
مۆنتاژی کۆمپیوتەر: خودی وەرگێڕ
دیزاینی بەرگ: ئارام عەلی
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
نرخ: ١٠٠٠ دینار
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپی یەکەم: ساڵی ٢٠١٣
کوردستان ـــ سلێمانی
www.serdem.net
بۆ پەیوەندیکردن بە زنجیرەی کتێبەوە:
kteb@serdem.net

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١١٦٤)ی ساڵی ٢٠١٣ پێدراوە



**سەرچاوە**
فى الثورة والقابلية للثورة
عزمى بشارة
المركز العربى للابحاث و دراسة السياسات
(معهد الدوحة)

## دەربارەی چەمکی شۆڕش

ئەرستۆ لە کتێبی «سیاسەت»دا دەڵێت، گشت شێوازەکانی حوکمڕانی تووشی شۆڕش دەبن، بە هەردوو شێوازی بنچینەیی حوکمڕانیشەوە: ئۆلیگارشی (حکومەتی کەمینە) و دیموکراسی، هەروەها ئەوەی بە سیستەمی حوکمڕانیی هاوسەنگ، یان دەستووری، یاخود ئەریستۆکراتی ناویدەبات، ئەم سێ زاراوەیەش تاڕادەیەکی زۆر هاوواتان. ئەرستۆ پێیوابوو، لە ئۆلیگارشی و دیموکراسیدا چەند توخمێکی دادپەروەری هەن، بەڵام کاتێک بەشی حوکمڕانەکان یان میللەت لە حوکمڕانیدا تەبانابێت لەگەڵ وێناکردنی پێشوەختیان بۆ ئەو بەشە، ئەوا هەریەکێکیان تووشی مەترسیی شۆڕش دەبێت. پێویستە شتێکی تریش بخەینە سەر بەکارهێنانی چەمکی «وێناکردنی پێشوەخت» لەلایەن ئەرستۆوە: ئێمە بۆشمان ڕوونبۆتەوە، ئەوە ڕژێمی باوە کە بۆتە هۆی ئەو وێناکردنە.

ئەرستۆ شۆڕشەکان بەسەر دوو جۆردا

دابەشدەكات: جۆرێک دەبێتە هۆی گۆڕینی دەستووری باو و سیستەمی حوكمڕانی دەگۆڕێت بە یەكێكی تر، جۆرێكی تر حوكمڕانەكان لە چوارچێوەی بونیادی سیستەمی باودا دەگۆڕێت (١). لەوانەیە ئەم دابەشكردنە ئەرستۆییە بنەمای ئەو جیاوازییە هاوچەرخانەی نێوان **شـــۆڕش** لەلایـــەک و **ڕیفـۆرم** و **ئینقیـلاب** (كودەتـــا) لەلایەكی ترەوە بێت، كە دواتر باسیاندەكەین. شایانی باسە، ئەرستۆ پێیوایە، گوێزانەوە لە سیستەمێكەوە بۆ یەكێكی تر، پرۆســـەیەكی بازنەییـــە، واتە چەنـــد دووبارەبوونەوەیەكی نیمچـــە حەتمییـــە. بەم مانایەش نابێتە مایەی سەرهەڵدانی نوێ، واتە بەشێک نابێت لە پرۆسەی گەشەكردن و پێشكەوتن.

پێدەچێت لای ئەرستۆ دیموكراسی كەمتر لە ئۆلیگارشی تووشی شۆڕش دەبێت، چونكە دەشێت ململانێ یـــان كێشـــمەكێشـــەكان لـــە حوكمڕانیـــی ئۆلیگارشیدا لەنێوان میللەت و چینی حوكمڕان، یان لەناو خودی چینی حوكمڕاندا بێت، بەڵام لە دیموكراسیدا كێشمەكێشی شیاو تەنیا لەگەڵ چینی حوكمڕاندایە و ململانێیەكی وەها لەناو خودی میللەتدا نییە شـــایانی باســـكردن بێت (٢). ئەمەش وێناكردنێكی ســـەیرە بۆ واقعێكی جیاواز، چونكـــە بێگومان ئەرستۆ، لەسەر ئاستی شوناسی میللەت لە باری دیموكراسیدا، دان بە لێكچووندا دەنێـــت.

ئەمەش ئەوەمان وەبیردێنێتەوە، کـە دیموکراسیی «پۆلس»ی یونانی، جگە لە دیموکراسییەکی ئەهلی شتێکی دیکـە نەبوو. کەچی دواتـر دەگەڕێتەوەو جیاوازیی لەسەر ئاستی ئەوەی پێیدەڵێت ڕەگەز (race) بە یەکێک لە هۆکانی ململانێ دادەنێت، ئەمەش لەکاتێکدا فرەڕەگەزی لە تاقە دەوڵەتێکدا دەبێت. لێرەشدا چەندین نموونە لە مێژووی شار و کۆلۆنییە یۆنانییەکانی سەر کەنارەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دێنێتەوە (٣).

کاتێک جەماوەر لەسایەی ئۆلیگارشیدا شۆڕش بەرپادەکات، کە بیرۆکەی مامەڵەنەکردن لەگەڵی بەشێوەیەکی دادپەروەرانە زاڵدەبێت بەسەریدا. بیرۆکەکەش بۆیە زاڵدەبێت، چونکە جەماوەر هەستێکی پێشوەختی دەبێت سەبارەت بەوەی ئەوان یەکسانن، بۆیە پێویستە تاکەکانی وەک چەند تاکێکی یەکسان مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت. کەچی ڕابوونی وەجاخزادە و پیاوماقوڵەکان لە دیموکراسییەکاندا لەبەرئەوەیە کە چونکە هەست بە جیاکارەبوونی خۆیان دەکەن، لەکاتێکدا بەشێکی وەک ئەوانە بەدەستدێنن، کە لە ڕووی پایەبەرزی و شایستەبوونە باڵادەستترن لێیان. لە هەردوو باریشدا مەرجێک زەقدەبێتەوە، ئەویش گریمانەیەکە دەڵێت، یەکسانبوونی مرۆڤەکان لە چوارچێوەی

کۆمەڵێکی دیاریکراودا، پاساو بۆ یەکسانی دەهێنێتەوە (٤) و نایەکسانبوونیش بەدرۆیدەخاتەوە. گریمانەی یەکسانبوونەش کۆششکردن بۆ دامەزراندنی سیستەمێکی دیموکراتی بەرپادەکات، یان هانی قبوڵکردنی سیستەمی دیموکراتیی باو دەدات. ئەمەش پەیوەندیی دامەزرانی کۆمەڵ و چوونە ناوییەوەو ئەندامێتیی یەکسان تیایدا لەگەڵ بیرۆکەی دیموکراسی لێکدەداتەوە، بەو شێوەیەی لە تەک نیشتمانپەروەریدا گوێزراوەتەوە بۆ سەردەمە نوێکان. چونکە لەگەڵیدا ئەو بناغە مەعنەوییە گوێزراوەتەوە، کە پشتبەستووە بە یەکسانی بەهۆی ئەندامێتیەوە لە کۆمەڵەدا، وەک شۆناسێک (٥) لە چوارچێوەی کۆمەڵی وێناکراودا، واتە شوناسی نیشتمانی یان نەتەوەیی.

شۆڕشی فەرەنسی تەنیا شۆڕشێکی دیموکراتی نەبوو، بەڵکو شۆڕشێکی نیشتمانیش بوو. ئەوەش بە ڕێکەوت نییە، چونکە دیموکراسیی نوێ لە ڕێگەی هەستکردنی نەتەوەوە بەسەروەریی خۆی بەهۆی مافەکانی هاوڵاتیانەوە، لە بەرامبەر ئەو فۆڕمەی پێشوو سەریهەڵداوە، کە تیایدا بەربژێرییەکانی ئەریستۆکراسی/ کەمینە لەلایەک و نەبوونی مافەکانی میللەت لەلایەکی ترەوە نەتەوەیەک بەهیچ مانایەک پێکناهێنێ. هەڵکشانی چەسپینی هەستی نەتەوایەتی، بڵاوبوونەوەی زمانی نەتەوەیی،

پەراوێزخستنی زمـان و شـێوەزارە ناوچەییەکان، یەکخستنی سیستەمەکانی خوێندن و کارگێڕی، لەناوبردنی سـەربەخۆیی هەرێمایـەتی و ناوچەیی ئەسـقەفییەکان (خانـە ئایینییەکانی مەسـیحی)، نەهێشتنی دەستەکانی ڕاسپێریی تەقلیدیی خاوەن سروشتی دەرەبەگایەتی، گشتاندنی سەربازگیریی تەوزیمیو سروودی نیشتمانی... و ئەو پێکهێنەرانەی تر کە دواتر بوونە تایبەتمەندییەکانی بزووتنەوە ناسیونالیستەکان. شۆڕشەکانی سالانی١٨٢٠- ١٨٤٨، لە بارودۆخەکانی یۆنان، پۆلۆنیا، ئایرلەندا، هەنگاریا، سربیا، بروسیا و ئەوانیتردا، گرێدرانەوە بە پرۆسەی پەرەپێدانی هەستی نەتەوایەتی و خەملاندنی خودی نەتەوەوە. واتە شوناسی شۆڕشە دیموکراتییەکان بەشداریکرد لە خەملاندنی نەتەوەدا، وەک کۆمەڵێکی خاوەن مافە سیاسییەکان یان بەپێچەوانەوە، چونکە هەندێک جار بزووتنەوە نیشتمانیەکان بوونە مایەی پیادەکردنی دیموکراسی. بەڕای ئێمە، کاتێک شۆڕشە دیموکراتییەکانی عەرەب سەرکەوتوودەبن لە بنیاتنانی دامەزراوە دیموکراتییەکاندا، دەتوانن بەشداریبکەن لە خەملاندنی ئەو شـوناسـە نیشتمانییەی هەتاکو ئێستا لەو قەوارانەدا ڕەوایەتیی تەواوەتی بەدەست نەهێناوە، کە بە چەند دەوڵەتێکی ناوچەگەر دانراون. ئەگەر دیموکراسیش بەکردەوە دامەزرا، ئەوا لەسەر

حسابی نەتەوەی عەرەب نابێت، بەڵکو تێگەیشتنی نەتەوەی عەرەب سەرەبارەت شوناسی کولتووری، شـــەریکایەتیی ویژدانـــی و چەندیـــن بەرژەوەندیی سیاسی و ئابووریدا دەگۆڕێت کە شوناسی نیشتمانی کامڵدەکەن، ئەمەش بەڕای ئێمە گۆڕانکارییەکی گرنگە. کێشەکە ئەوەیە، لەوانەیە لەو دەوڵەتانەدا کە شۆڕش ناتوانێت شەوق بۆ ئازدی بگۆڕێت بۆ دیموکراسی، قەوارە نیشتمانییەکان هەرەسبهێنن، بەتایبەتی ئەگەر دەوڵەتەکە فرەشوناس بێتو نەتەوەی هاوڵاتیبوون بنیات نەنێت. ئەمەش لە عیراق، پاش داگیرکردنی لەلایەن ئەمریکاوە، ڕووی دا. بۆیە پێویستە جیاوازی بکرێت لەنێوان شەوق بۆ ئازادی و پرۆسەی بنیاتنانی دیموکراسی پاش شۆڕشو سەرکەوتنی بنیاتنانی دامەزراوە نیشتمانییەکان لەسایەی شوناسی عەرەبیی کۆکەرەوەی ئەو دەوڵەتانەدا، وەک مەرجی بەردەوامبوونیان وەک چەند قەوارەیەک پاش هەرەسهێنانی سیستەمی باو.

بەگشـتی ئەرسـتۆ پێیـوایـە، تـەنانـەت ستەمکاران دەگەنە حوکمڕانی، ئەنجامی تواناشیان لە بواری گۆشکردن و کۆکردنەوەی هەژارەکاندا دژی دەوڵەمەندەکـان یـان وەجاخزادەکـان، ئۆلیگارشی دەگۆڕن بۆ سـتەمکاری. گەلێک جار ستەمکاری هەستی خەڵک بەرامبەر بە یەکسـانی دەبزوێنێ،

بەڵام بەرامبەر بە یەکسانیی وەک حوکمڕانیکراوەکان، نەک حوکمڕانەکان. بۆیە حوکمڕانیی ستەمکاری – لە ڕوانگەی ئەرستۆوە – ئاوێتەیەکی دیموکراسی و ئۆلیگارشییە بەشێوە توندڕەوەکەیان (٦)، واتە خراپترین شتی هەردووکیان لەخۆدەگرێت. بۆیە بەگشتی دیماگۆگییەت پێش ماوەکانی ستەمکاری دەکەوێت. ئەوە دیماگۆگەکانن خەڵک دژی دەوڵەمەندەکان و دەستەبژێر بەگشتی کۆدەکەنەوەو بە یەکسانی ختوکەی هەستی گشتی دەدەن. دیماگۆگ ئەوەیە کە دەگۆڕێت بۆ ستەمکار و بەناوی هەژارانەوە حوکمڕانیدەکات. حەنە ئارندت دەڵێت «ستەمکارەکانی سەردەمە کۆنەکان– وەک ستەمکارەکانی سەردەمی نوێ – بەهۆی پشتگیریکردنی خەڵکانی سادە یان هەژارانەوە دەسەڵاتیان گرتۆتەدەست». بێگومان ئارندت، لە ژێر کاریگەریی دەسەڵاتگرتنەدەستی سەرکردە فاشی و نازی و کۆمۆنیستەکان لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، بیروڕاکانی نووسیوەو پێیوایە دەرفەتی مەزنی ئەو سەرکردانە بۆ پاراستنی دەسەڵات، هەڵقوڵاوی خواستی خەڵکە بۆ یەکسانی لە هەلومەرجی کۆمەڵایەتیدا. ئەگەرچی گشتاندنەکەی وەک گشتاندن ڕاست نییە، بەڵام هێشتا بۆ زۆرێک لەو بارودۆخانە ڕاستە کە ڕەوایەتیی ستەمکاری، هەڵقوڵاوی دەستەبەرکردنی هەلومەرجی کۆمەڵایەتیی

یەکســانە بۆ خەڵک. ئەم یەکســانییەش زۆرجار لەسەر بنچینەی یەکسانییە لە هەژاریدا یان پلەیەکی تۆزێک بەرزتر لە هەژاری. هێشتا دەستەبەربوونی پێداویستییە بنچێنەییەکان، یەکێکــە لــە گرنگترین هۆکانی مانەوەی ستەمکاری. هەروەها لەدەستدانی سەرچاوەی ئەم «ڕەوایەتی»یە لە ڕێگەی هەژارکردنەوە (بۆ نموونە بەهۆی لیبرالیزەکردنی ئابوورییەوە) بەبێ جێگرتنەوەی بە سەرچاوەکانی تر (وەک ڕەوایەتیی دیموکراتیانە) یەکێکە لەو هۆیانەی زەمینە بۆ بەرپاکردنی شۆڕش دژی ستەمکاری خۆشدەکات (٧).

لەوانەیە سوودبەخش بێت لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، دیموکراسی یەکسانیی نێوان خەڵک لە تاقە مەسەلەیەکدا دەگۆڕێت بۆ یەکسانیی لە هەموو شــتەکاندا، لەکاتێکدا ئۆلیگارشی یەکســان نەبوونی نێوان خەڵک لە هەندێک مەسەلەدا دەگۆڕێت بۆ نەبوونی یەکســانی لــە هەمــوو مەســەلەکاندا، بۆیە زۆرجار یەکێکیان دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ئەویتریان. سەبارەت بەو ئەریستۆکراسییەی ئەرستۆ پێی باشترە، ئەوا بەڕادەیەکی نایەکسان مامەڵە لەگەڵ خەڵک دەکات، چونکە ئەوان لە هەندێک مەسەلەی دیاریکراودا نایەکسانن، هەروەها بەڕادەیەکی یەکسانیش مامەڵەیان لەگەڵ دەکات، چونکــە لە هەندێک مەسەلەی تردا یەکسانن. هەموو ئەوانەش

بەپێی پێویستی و شایستەبوون دەچنەڕێوە. لێرەوە پایەبەرزان (Virtue) و لێهاتووەکان (Merit) حوکمڕانیدەکەن، بەڵام ئەوانە دەزانن لە ڕوویەکەوە لەگەڵ خەڵک جیاوازن و لە هەندێک ڕووی ترەوە یەکسانن لەگەڵیان، لەسەر ئەم بنچینەیەش مامەڵەیان لەگەڵ دەکەن. ئەم پێوانەیەش، لە ڕوانگەی بیریارێکی یۆنانییەوە پێش هەزاران ساڵ، بنچینەی دەستوورە باشەکانە.

**ئایا دەستنیشانکردنێکی زانستیی چەمکی شۆڕش لەئارادایە؟** دەتوانین بیڵێین، چەندین هەوڵدان هەن، بەڵام سەختە هەڵکشێن بۆ ئاستی پێناسەی زانستی، چونکە بەکارهێنانی وشەکە لە زمانی ڕۆژانە و تەنانەت نووسینی مێژووییدا باوە. هەروەها وەک ناوێک بەخشراوەتە ژمارەیەکی زۆر دیاردەی جیاواز لە ڕووی توندوتیژییەوە، لە بزووتنەوەیەکی چەکدارییەوە – یان تەنانەت ناچەکداری – دژی ڕژێمێکی دیاریکراو دەستپێدەکات، هەتاکو دەگاتە ئەو بزووتنەوانەی ڕووخاندن و گۆڕینی ڕژێم ڕادەگەیەنن، ئەمەش پرۆسەی کۆڵینەوە لە زاراوەکە سەختدەکات. لە خودی زمانی عەرەبیشدا وشەکە بەکارهێنراوە بۆ وەسفکردنی چەندین بزووتنەوەی میللیی هەمەجۆر، وەک «شۆڕشی قەرامتەکان». عەرەبەکانی سەدەی بیستەمیش، کە کەوتبوونە ژێر کاریگەریی شۆڕشەکانی سەردەمەکەی خۆیانەوە، بەکاریانهێناوە

بۆ تێگەیشــتن لە ڕابردوو بەهۆی چەمکەکانی ئێستاوە. وەک هەوڵدانێکیش بۆ خۆبەستنەوە بە میراتێکی شۆڕشگێڕیی دیاریکراوەوە، شۆڕش وەک پرۆسەی خەباتی چینە چەوساوەکان دەخرێتەڕوو. بەوجۆرەش، وەک چۆن شــۆڕشــی قولەڕەش و قەرامتەکان هەبووە، ئاوەهاش شۆڕشی عومەر موختار (١٨٦٢ –١٩٣١)، شۆڕشی لادێ بە سەرکردایەتیی محەمەد کوڕی عەبدولکەریم خەتابی (١٨٨٢–١٩٦٣)، شۆڕشی جەزائیر، شۆڕشی فەڵەستین، شۆڕشی ٢٣ی تەمموز/ یولیۆی ١٩٥٢ بەسەرۆکایەتیی جەمال عەبدولناسر (١٩١٨–١٩٧٠)و شۆڕشی ١٤ی تەمموز/ یولیۆی ١٩٥٨ بەسەرکردایەتیی عەبدولکەریم قاسم (١٩١٤–١٩٦٣) هەبووە. ئەمەش ڕێبازی شۆڕشگێڕە ئەوروپییەکانی ســەدەی نۆزدەهەم بوو، کــە ناوی «شۆڕش»یان بەخشییە یاخیبوونی کۆیلەکان لە ڕۆمای کۆن، بە سەرکردایەتیی سپارتاکۆس (شۆڕشی کۆیلەکان). هەروەها ڕێبازی چەپی ئەڵمانی بوو، لە سەردەمی کارل مارکسەوە، بۆ بەخشینی ناوی «شــۆڕشــی جوتیاران» بە بزووتنــەوەی ئایینی هەزارینەی ڕزگارکــەر بە ســەرکردایەتیی تۆماس مونتسەر– کە مێژووناسە ئەوروپییەکان دەیانخستە ناو چوارچێوەی «ڕیفۆرم»ەوە–، یان ئەو بزووتنەوە ئایینییە ڕزگارکەرانەی ئەنجامی ئەو هاتنەئاراوەو

پرۆسەیەکی فرە ڕەهەند و دیاردەی بزووتنەوە ئایینی، کۆمەڵایەتی، ناڕەزاییدەربڕ و شۆڕشگێڕانەی لەخۆدەگرت. ئەمەش هێماکردنە بۆ جیاوازیی لەنێوان ڕێبازی بیریار و ڕێبازی مێژووناسدا.

بەڵام بەکارهێنانی وتەکە بۆ وەسفکردنی ئەو یاخیبوونە میللییانە درەنگەوەختانێک و لە ژێر کاریگەریی ئایدیۆلۆژییە شۆڕشگێڕییەکانی سەدەی بیستەمدا بوو، دەتوانین گرنگیی شۆڕشی فەرەنسی، شۆڕشی ئۆکتۆبەر، شۆڕشی چین و شۆڕشی کوبا لە نیوەی دوەمی سەدەی بیستەمدا بهێنینەوە بەرچاوی خۆمان، ئینجا چەمکی شۆڕش بەرپاکردن دژی دیکتاتۆریەتەکانو دەسترۆیشتنی ئەمریکی لە ئەمریکای لاتین بووە زاراوەیەکی سەرەکی لە لاهوتی سیاسیی ڕووناکبیرانی چەپی جیهانی سێیەمدا بەگشتی.

سەبارەت بە مێژووناسە دێرینەکانی عەرەب، ئەوان وشەی «شۆڕش»یان بەکارنەهێناوە، بەڵکو وشەکانی وەک «دەرچوون» و «ئاژاوە» یان بەکارهێناوەو وتویانە «ئاژاوەی قولەڕەشەکان»و «دەرچوونی قەرامتەکان». لە واقیعدا ئاژاوە ململانێیەکی ئەهلییە و بە توندوتویژی، هاوسەنگیی سیاسی و کۆمەڵایەتیی باوی نێوان کۆمەڵە ئەهلییەکان تێکدەدات. پێدەچێت ئەوە- لە ڕووی مەرجەعییەتەوە - گرێدراوی تێگەیشتنی ئیسلامی بێت بۆ یەککگرتوویی و

سەقامگیریی کۆمەڵ، کە بۆ خۆی پەیوەندیی بە بەهێزکردنی بزوێنەرەکانی ئاوەدانکردنەوەوە هەیە، واتە بنیاتنانی شارە سەقامگیرەکان و پلانەکانیان بەرامبەر بە شێوازی کۆمەڵگەی بیابان نشینی دابەشو شڵەژاو. بۆیە تێگەیشتنی مێژووناسەکانی عەرەب لەوەی مێژووناسـه هاوچەرخـەکان بە «شـۆڕش» ناویدەبەن، ملکەچی ئـەو ڕەوتەیـە کـە کۆنترۆڵی هاتنەئارای کردوە، ئەویش دانانی دەرچوونە لە کۆمەڵ بە وێرانکردنی ئاوەدانی. دەرچوون لە کۆمەڵ یان نەتەوە هۆی زەمکردنی خەوارجەکانە، بەڵام سەبارەت بە دەرچوون دژی سوڵتانی ستەمکار، بیروڕا دەربارەی هەمەجۆر بووە، هەندێک بە دەرچوون لە کۆمەڵ دایانناوە و هەندێکی تر بە مەسەلەیەکی ڕەواو تەنانەت لە هەندێک باردا بە ئەرکیان داناوە.

نزیکتریـن وشـە لـە چەمکـی (شـۆڕش)ی هاوچەرخەوە «دەرچوون»ـە، بەواتای دەرچوون بۆ داواکردنی ماف، چونکە دەرچوون لێرە و لەسەرەتادا دەرچوون نییە لە کۆمەڵ، تەنانەت دەرچوون نییە لە دژی سوڵتان، بەڵکو «دەرچوونە بۆ»، دەرچوونە بۆ ناو خەڵک بەمەبەستی داواکردنی ماف. لەم بارەشدا، دەرچوونە بۆ ناو فەزای گشتی، بەمەبەستی بەدەستهێنانی مافێک، یان نەهێشتنی زوڵمێک(٨). ئەمەش **یەکەم** دەرچوونە لەماڵەوە بۆ سەر شەقام

یان ناو گۆڕەپان، واتە جێهێشتنی دان بەخۆدا گرتنو سکاڵاکردن و بێزاری دەربڕین و باری ناڕازیبوونە لە فەزای تایبەتداو گوێزانەوەیانە بۆ فەزای گشتی. جیاوازی لەنێوان ڕەخنەگرتن و بێزاری دەربڕیندا، یان لەنێوان سکاڵاکردن و کاری سیاسیدا، وەک جیاوازیی نێوان دانیشتن و دەرچوونە. **دوەم** دەرچوونە لە ڕێساکانی گەمەکردنو یاسا بەکارەکانو ڕەوایەتیی باو، دەرچوونەکەش مانای هێز و توندوتیژی لەخۆدەگرێت، چونکە سەرپێچیی هەندێک لەو یاساو ڕێسایانە دەکات کە لەئارادان، هەروەها سەرپێچیی ئەو بونیاد و ئامرازانەشە کە یاساو ڕێساکان دەپارێزن. دەرچوونیش لە ڕەوایەتیی باو، بۆ هێنانەدیی مافێکی دیاریکراوە کە ناکرێت لەسایەی ڕژێمێکی باودا بێتەدی، یان بۆ نەهێشتنی زوڵمێکە کە ناکرێت لەسایەی ئەو ڕژێمەدا و بەهۆی ئەو ئامرازانەی دەستەبەریکردون لەناوببرێت. ئەمەش خاڵی هاوبەشی نێوان دەرچوونە بەو مانایەی لە مێژووی ئیسـلامیدا بەکارهێنراوە و شۆڕشە بەمانا نوێکەی.

# دەرچوون و زاڵبوون
# تیۆرێک نییە دەربارەی شۆڕش

سەرسوڕمانێک دەربارەی دەرچوون ناوبانگی دەرکردوە، کە دەگێڕدرێتەوە بۆ ئەبی زری غەفاری (ساڵی ٣٢ی کۆچی دوایی کردوە): «سەرم لەوە سوڕماوە، چۆن ئەوەی خۆراک لە ماڵەکەیدا نییە ناچێتە دەرەوە بۆ ناو خەڵک و شمشێرەکەی ڕاناکێشێت!» لەو ڕۆژەوە چەمکی «دەرچوون» ناوەڕۆکێکی هێمادار جیاوازی بەخۆوەگرتووە، کە بارگاوییە بە هەندێک لە دەرچوونەکەی ئەبی زر و تیایدا دەرچوون مانای یاخیبوونی چەکدارانەیە دژی دەسەڵاتی باو، وەک دەرچوون لە ڕەوایەتی و چوون بۆ ناو فەزای گشتی، بەتایبەتی کاتێک دەرچوون بۆتە میکانیزمێکی گۆڕانکاری لە کۆمەڵگەیەکدا، کە لەنێوان میللەت و دەوڵەتی سوڵتانیدا دابەشبووە.

لەوانەیە «زاڵبوون» ئەو زاراوەیە بێت کە زانایانی ئایینی وەک دەروازەیەک بەکاریانهێنابێت بۆ بەخشینی ڕەوایەتیی واقیعی بە دەسەڵات لە

چوارچێوەی خیلافەتی ئیسلامیدا و زانا ئایینیەکان و مێژووناسەکان لە سەردەمی ماوردی (٣٦٤-٤٥٠ک) و تەنانەت ئیبن خەلدونەوە (٧٣٢ -٨٠٨ک) تیۆریزەیان بۆ کردوە و چەمکێکە بەرامبەر بە دەرچوون. ئەوەش لە ڕێگەی ڕەوایەتیپێدانی سوڵتانییەوە، بەهۆی بەخشینی ڕەوایەتییەوە بە پرۆسەی بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات، بەرامبەر بە پیشاندانی وەلا بۆ خەلیفە. زاڵبوون ئەو پێشینەیەیە کە دەرچوون تیایدا سەرهەڵدەدات و ئاکامی چاوەڕوانکراویشیەتی، بەجۆرێک کە دوانەیەکی بەردەوام (دەرچوون/ زاڵبوون) هاتۆتەئاراوە، نەک دژایەتیکردن و لایەنگیریکردنی دوو لیست لە پەیوەندییەکی ململانێ و پێکەوەهەڵکردنی ناو ڕژێمی باو. بۆیە ئیبن خەلدون گەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی دەوڵەتی نوێ- واتەی ئەوەی بەری دەرچوونە- ناوبنێ «دەوڵەتی دەرچوون» یان «دەوڵەتی خەوارجەکان»، مەبەستیشی لەمە تیمی خەوارجەکان (٩) نییە، کە لە مێژووی ئیسلامیدا بە ڕووداوی ناوبژیوانیی نێوان عەمرو کوڕی عاس و ئەبی موسای ئەشعەریی ناسراوە. پێدەچێت ئیبن خەلدون عەلی بەدرەدین کوڕی جەماعە (٦٣٩ -٧٣٣ک)، کە لە قاهیرەی مەملوکی ژیانی بەسەربردووەو ساڵێک پێش لەدایکبوونی ئیبن خەلدون کۆچی دوایی کردوە، لە کتێبی (**تحریر الاحکام فی تدبیر اهل الاسلام**) دا نووسیویەتی: «ئەگەر ڕۆژگار بێ پێشەوا بوو و

یەکێک پێشەوایەتیی گرتە دەست کە شایستەی نەبوو و بەهێز و توانا و سەربازەکانی خۆی و بەبێ بەدەستهێنانی بەیعە خیلافەت خەڵکی سەرکوتکرد، ئەوا بەیعەکە بڕێنراوەتەوە و پێویستە ڕێزی لێ بگیرێت، هەتاکو موسڵمانەکان یەکگرتووبن و قسەیان یەک بێت، بۆ ئەمەش لەڕاستیدا گرفت نییە ئەو کەسە نەفام یان داوێن پیس بێت. ئەگەر پێشەوایەتی بەهێز و زاڵبوونی یەکێک بڕێنرایەوە، ئینجا یەکێکی تر هات بەهێز و سەربازەکانی خۆی زاڵبوو بەسەر ئەوەی یەکەمدا، ئەوا ئەوەی یەکەم لەکاردەکەوێت و ئەوەی دوەم دەبێتە پێشەوا، لەبەر بەرژەوەندیی موسڵمانەکانی و لەپێناو یەکخستنی قسەیاندا» (١٠)

ئیبن تیمیە (٦٦١ -٧٤٤ک) لە شیکردنەوە واقعییەکەی ئەوەوە نزیکبوو، چونکە پێیوابوو ماوەی خیلافەتی ڕاشدین لەواقیعدا درێژەپێدانی ماوەی پێغەمبەرایەتییە، ئەوەی لەو ماوەیەوە بەکردەوە لەئارادابوو، موڵکداری بوو نەک خیلافەت، شەرعیش ئەوە حەرام ناکات. ئەو «پاشا»یەش بە «پاشای پەلاماردەر» دەناسرێت. زانایانی ئایینی ئەو قۆناغە لەسەر ئەوە کۆکبوون، کە یەکگرتوویی نەتەوە و پێشەوایەتی بپارێزن و بەردەوامبوونی پارچەپارچەبوون ڕەتبکەنەوە، تەنانەت ئەگەر نرخەکەی پاساوهێنانەوەش بێت بۆ سوڵتانی ستەمکار.

زانایانی ئایینی موسڵمان تێگەیشتنێکی ئایینی وەهایان خستەڕوو کە پەیوەندیی بە واقیعەوە نەبوو، وەک ئەوەی دەیانوت خیلافەت بە ڕاوێژی (ئەهلی حەل و عەقد) ببڕێنرێتەوە، ئەمەش گۆڕاو بۆ چەند گوتەیەکی ڕەخنەگرانەو لە هەندێک باردا دژی واقعی خیلافەت دەوەستایەوە کە ببوو بە موڵک، هەتاکو ئیمام ئیبن حەنبەل (١٦٤ -٢٤١ک) لە سـەدەی سێیەمی کۆچیدا هات و پاساوی بۆ بەدەستهێنانی خیلافەت لە ڕێگەی زاڵبوونەوە هێنایەوە (مەبەست لەکاتی خۆیدا پاساوهێنانەوە نەبوو بۆ میرنشینی لە چوارچێوەی خیلافەتدا، چونکە لەو سەردەمەدا ئەوە لەئارادانەبوو)، ئەوەش بەدەربڕینی: «ئەوەی زاڵبێت بەسەریاندا دەبێتە خەلیفە و پێیدەوترێ میری ئیمانداران، هەرکەسێکیش بڕوای بە خواو دوارۆژ هەبێت، نابێت ڕەتیبکاتەوەو بە میری خۆی نەزانێت، جا ئەو زاڵە چاکەکار بێت یان خراپەکار، چونکە ئەو میری ئیماندارانە» (١١) حەنبەلییەکانی دواتریش، وەک ئەبی یەعلای فەرا (٣٨٠-٤٥٨ک)، بەم شێوەیە شرۆڤەیانکردوە: «مەبەست لە زاڵبوون لێرەدا ئەوەیە کە بەیعە دوای زاڵبوون دێت و زاڵیش دەکاتە خەلیفە، نەک خودی زاڵبوون» (١٢). لەڕاستیدا بەیعە گەلێک جار بەشێک بووە لە زاڵبوون، وەک باری ڕاپرسی لەسەر سەرۆک کۆماری سەردەمەکەمان، پاش ئەوەی

بە ڕێگەی کودەتای نادیموکراتی دەسەڵات دەگرێتە دەست، بەو جۆرەش سەرەنجامی ڕاپرسییەکە ڕەوایەتییەکی دەستووری دەکات بە بەریدا. شایانی باسە، ڕاگەیاندنی ڕەسمی– تەنانەت لەباری ڕاپرسیدا – دەربارەی خولێکی تری سەرۆکایەتی لە کۆماری عەرەبیی نادیموکراتیداو تەنانەت لە باری میراتگریدا، ڕاپرسـی ناودەنێت «بەیعـە»، وەک هەوڵدانێک بۆ وەبەرهێنانی سـمبولخوازیی ئیسـلامی دەربـارەی «ڕەوایەتی»ی حوکمڕانی.

ئەبو حەسەن عەلی کوڕی محەمەد ماوردیی شافعی (٣٦٤–٤٥٠ک)، لە سەدەی پێنجەمی کۆچیدا، سـەبارەت بـە مەسـەلەی «زاڵبوون»ی واقعیانە، شوێن پێی ئیبن حەنبەلی هەڵگرتو لە کتێبەکەیدا «**الاحکام السلطانیة**» بەهانـەی هێناوەتـەوە بـۆ چەندین شێوازی گەیشتنە حوکمڕانی لەو سەردەمەی پێیدەوترێ عەباسیی دوەم، وەک میرنشینیی ناچاریو دەستبەسەراگرتن (بەکردەوەش مەبەسـتی لـەوە سەڵتەنەت یان میرنشینی بویهیی بوو لەسایەی خیلافەتی عەباسیدا)، سەرباری ویلایەتی پێسپاردن لەلایەن میری پێشووەوە (واتە میراتگری) و هەڵبژاردنی (ئەهلی حەل و عەقد). میری بویهی نازناوی «میری میرانی» بەدەستهێنا، کە لای هەندێک گەشەیکرد بۆ سوڵتان، بەڵام ئەوە هەر خەلیفە بوو کە ڕەوایەتیی

دەکرد بەبەریدا. تێگەیشتنی ماوردی لەنێوان واقعی میرنشینی دەستبەسەراگرتنی بویهی و خیلافەتی ڕەوای عەباسیدا مایەوە، بۆ پاراستنی پێشەوایەتی وەک ڕەوایتی بەخش، لە باری ئەو لێکدانەوەیەدا کە لێبووردە بوو لەگەڵیدا.

ئەوە بەهێزێکی زیاترەوە لای ئەشعەرییەکان، بەتایبەتی ئەبی حەسەن ئەشعەریی کوڕی موجاهید بەسرِی (ت. ٣٧٠ک)، دەبینینەوە. ئەبی حەسەن ئەشعەرییەکی مالکی بوو، تەنانەت ڕێگەی لەوە گرت کە نموونەکانی وەک ماوردی، ناسراو بە واقعیبوونی سیاسی، ڕەخساندبوویان، واتە دەرچوون دژی پێشەوا خراپەکار و ستەمکارەکان. ئەمەش ڕەنگدانەوەی فەلسەفەی سەقامگیری و یەکگرتوویی «کۆمەڵی موسڵمانەکان»ـە بەشێوەی «سوڵتانێکی زۆردار لە فیتنەیەکی بەردەوام باشترە». ئیبن حەزمی زاهیری (٣٨٤ -٤٥٦ک) بەرەنگاری ئەبی حەسەن بوەوە و دەرچوونی ئیمامەکان - لەوانە باشترین هاوەڵانی پێغەمبەر- دژی مەعاوییە و دەرچوونی حەسەن بەسرِی و گەورە پێڕەوکاران بە شمشێرەکانیان دژی حەجاجی(١٣) بە بەڵگە هێنایەوە. لەگەڵ ئەوەشدا گوتاری واقعیبوونی سیاسی، کە گوزارشت لە ناوبژیوانیی دەق و دەوڵەت لەلایەن دامەزراوەی ئایینیەوە دەکات، لای ئەو زانا ئایینییە ڕاڤەکارانە

بەردەوامبوو، کە بەهۆی لێکدانەوەی دەقەوە پاساویان بۆ حوکمڕانیی باو دەهێنایەوە. ئەمەش لای ئەبی عزی لێکدەرەوەی «**العقيدة الطحاوية**»و تەنانەت لای ئیبن تیمیە دەبینرێت.

لێرەدا پێویستە هەڵوێستی سەلەفیی ڕواڵەت و هەڵوێستی ڕاڤەکارانە بەگشتی لێک جیابکەینەوە، کە لەو قۆناغەدا ـ بەتایبەتی قۆناغی باڵادەستیی فیکری ئەشعەری ـ زاڵبوو. چونکە ئەوەی یەکەم لەکۆتاییدا لێبوردە نەبوو بەرامبەر بە حوکمڕانی داوێنپیس و لایدا بەلای ئەوانەی بۆ بەگژاچوونەوەی دەرچوون، تەنانەت هەندێک جار دەرچوون لە دژی ئەویان پێ باشتربوو، هاوکات هوشدارییان دا دەربارەی خراپەکانی دەرچوون، لەگەڵ ئەوەشـــدا لایەنگـــری ڕەتکردنـــەوەی ئاژاوە بوون بەشێوەیەکی گشتی و بەشێوەیەکی تایبەتیش دەرچوونیان دژی حوکمڕانەکان ڕەتکردۆتەوە، لەپێناو پاراســـتنی یەکگرتوویی نەتەوەدا. لەکاتێکدا گوتاری ڕاڤەکارانە لایداوە بەلای ڕەتکردنەوەی دەرچووندا دژی حوکمڕانو ڕوویکردۆتە پاساوهێنانەوە بۆ هەر ڕژێمێک، کە بەهۆی زاڵبوونو کۆدەنگیی نەتەوەوە دامەزرابێت. کۆدەنگیش ڕای جیاواز ڕەتدەکاتەوەو دەبێتە مایەی لەئارادانەبوونی ناڕازی، واتە کەمایەتییەک لەبەرامبەر زۆرایەتیو تەنانەت کۆدەنگی، هەر ڕایەکی تری جیاوازیش دەرچـــوون دەبێـــت لـــە کۆدەنگی. ئەم

دەرچوونەش لە کۆدەنگی، ڕووەکەی تری دەرچوونی سیاسییە، کە بۆ خۆی خراپەکاری و ئاژاوەگێڕی و زوڵمێکی بێوێنەیە.

ئەوەی سەرنجڕاکێشە، گوتاری سەلەفییەکانی سەردەمی ئێستا تەنیا لایەنێکی گوتاری دامەزرێنەرەکانی وەک ئیبن حەنبەل و ئیبن تیمیەیان وەرگرتووە، ئەویش ڕێگرتنە لە دەرچوون دژی سوڵتان. کەچی کاتێک ئاقارێکی سەلەفیی ڕەخنەگرانە سەریهەڵدا، نەریتێکی دەوڵەمەندی لای بەرەبابانی زانایانی ئایینی سەلەفی بینییەوە، کە پاساو بۆ دەرچوون دژی حوکمڕانی زۆردار دێننەوە. لێرەدا وردبوونەوە سوودبەخشە بۆ ئەوەی بزانین، ئەوەی دەرچوون لە دژی سوڵتانێکی ستەمکار حەرمدەکات، زۆرجار دەرچوون دژی سوڵتانێک حەرامدەکات دژی ئەوەی پێش خۆی دەرچووەو دواتر بەهۆی زاڵبوونێکەوە ڕەوایەتیی داوەتە خۆی، ئەمەش بۆتە کۆدەنگی و دەرچوون لە دژی بۆتە دەرچوون لە دژی کۆدەنگی. لێرەوە ئەو پشت بەو نەریتانە دەبەستێت کە هەڵیاندەبژێرێت و چەندین پاساوی ڕەوا بۆ دەرچوونی حوکمڕانی ئێستا دژی ئەوەی پێش خۆی دەبینێتەوە و پاساوەکانی دەرچوون لە دژی ڕەتدەکاتەوە و لەناو دەقەکاندا ئەوە دەدۆزێتەوە کە ئەو دەرچوونە حەرامدەکات.

ئیبن تیمیە بڕوای وابوو، میرنشینی لەسەر دوو بنچینە دادەمەزرێت: «هێــز و ســەڕاســتی»، ئەمەش پشتئەستوور بە چەند دەقێکی قورئان، کە هێــز لــە پێش ســەڕاســتییەوە باسکراوە، وەک: «چاکترین کرێگرتە ئەوەیە کــە بەهێز و سەڕاستە» (**القصص**:٢٦)، هەروەها قسەی خاوەنی میسر بۆ یوسف (د): «تۆ لەمڕۆوە لای ئێمە بەهێز و سەڕاستیت» (**یوسف**: ٥٤). هەروەها پشتی بە قسەیەکی بەناوبانگی ئەحمەد کوڕی حەنبەل بەستووە، کە هێزی لە پیاوچاکی بەلاوە گرنگترە، ئەمە ئەگەر بخرێتە بەردەمی هەڵبژاردنی یەکێکیان. ئەوەتا دەڵێت: «خراپەکاری بەهێز، هێزەکەی بۆ موسڵمانەکانەو خراپەکارییــەکەی بــۆ خۆیــەتی، بەڵام پیاوچاکی لاواز، پیاوچاکییەکەی بۆ خۆیەتی‌و لاوازییەکەی بۆ موســڵمانەکانە». لێرەوە ئیبن تیمیــە سیفەتەکانی دەسەڵاتدارێتیی لە دوو دانەی سەرەکیدا کۆکردۆتەوە، واتە هێز و سەڕاستی. بەمەش لەگەڵ زانایانی ئاییـنی سوننەو ئەوانەی تر جیاوازبوو کە چەندین سیفەتیان بۆ میر دانابوو، یان چەندین ڕێگەی دیاریکراویان بۆ دەسەڵاتگرتنەدەست‌دەستنیشانکردبوو،بەڵام‌لەناویاندا باسی دەستبەسەراگرتن بەهۆی هێزەوەیان نەکردووە، بەڵکو ئەوانە بەیعەیان پاش دەسەڵاتگرتنەدەست کردۆتە تەواوکەرێک بۆ ڕەوایەتیی حوکمڕانی و بە

کۆدەنگیی نەتەوەیان داناوە، دەرچوونیان لە دژی بە دەرچوون لە کۆدەنگی داناوە. چونکە توانا لای ئیبن تیمیە بنچینەی میرنشینیی واقعییە، لەکاتێکدا سەرڕاستی مەرجی ڕەوایەتیی میرنشینە. ئیبن تیمیە بیروڕایەکیشی هەیە کە ڕێگە بە دەرچوون دژی هەر حوکمڕانێک دەدات، بەمەرجێک پێڕەویی شەریعەتی ئیسلامی بکرێت، لەبەر ئەوەی ئەو دەرچوونی بەشێوەیەکی گشتی ڕەتنەکردۆتەوە، لەو کاتەدا نەبێت کە دەرچوون دەبێت لە شەریعەت. ئەمە لەکاتێکدایە کە جەغتی لەسەر ئەوەش کردۆتەوە، دەشێت دەرچوون خراپەکاریی زیاتر لە خراپەکارییەکانی حوکمڕانیی زۆردار بهێنێتەئاراوە. بزووتنەوە ئیسلامییەکان پشتیان بەمە بەستووە، کە ڕێگە بە دەرچوون دژی حوکمڕانی موسڵمان دەدات، ئەگەر لە ئایین هەڵگەڕابێتەوە یان حوکمڕانییەکەی پێچەوانەی شەریعەت بێت. بۆ ئەوەش پشتیان بە لێکدانەوەی هەڵوێستی ئیبن تیمیە بەستووە، کە دەرچوون لە دژی حوکمڕانیی تەتەرەکانی بەڕەوا زانیوە، چونکە لەنێوان خۆیاندا ئەو شەریعەتەیان پیادەکردوە کە بە «یاسق» یان «یاسە» ناسراوە، نەک شەریعەتی ئیسلام، ئەگەرچی هەردوو شایەتمانەکەشیان هێناوە.

ئیبن تیمیەی واقعبین بەگشتی شۆڕشی دژی حوکمڕانە ستەمکارەکان ڕەتکردۆتەوە، چونکە پێیوابووە

کە: «ئەوەی لای ئایینزاکانی سوننە بڵاوە ئەوەیە، کە بڕوایان نییە بە دەرچوون لە ڕێبازی پێشەواکانی خۆیان و بە شـــمشـــێر شەڕیان لەگەڵ ناکەن، با ستەمیشیان تیـــادا بەرجەســـتەبێت، هـــەروەک چـــۆن فەرموودە صەحیحەکانی پێغەمبـــەر (د.خ) ئاماژەی بۆ دەکەن... چونکە خراپەکارییەی لە ئەنجامی شەڕەوە پەیدادەبێت زۆر لەوە گەورەترە کە لە ستەمی ئەوانەوە پەیدابووە. بۆیە زۆربەی خراپەکاران بەرگرییان لە پابەندبوون بە ئێش و ئازار و ستەمەوە کردوە، تەنانەت نەمانبیستووە یەک تایەفەی لە ســـنووری دەسەڵاتدارێک دەربچێت، ئەگەر بێت و دەرچوونەکەی خراپەکارییەی لەپشتەوە نەبووبێ، کـــە زۆر گەورەتـــربووە لەو خراپەکارییەی ئەنجامی ستەمکاری هاتۆتەئاراوە..». ئیبن تیمیە جەغت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە دەبێت ملکەچی بۆ حوکمڕان بکرێت، بەو مەرجەی لە فەرمانی خوا دەرنەچن. بۆیە بەخەیاڵ لەگەڵ گرووپە شیعییەکان دەکەوێتە مشتومڕەوە: «قسەی ئەهلی سوننە زۆر ڕاست و دروست و دانایانەیە، قسەی ئەهلی ڕافزەش درۆو گەوێرییە. ئەهلی سوننە دەڵێن: میر و ئیمام و خەلیفە دەسەڵاتدارن و دەتوانن کارێک کە مەبەستیان بێت لە میرنشینەکەیاندا جێبەجێی بکەن. هەروەها پێشنوێژ ئەو کەسەیە نوێژ بەخەڵک دەکات و ئەوان متمانەیان پێیەتی بۆیە دەیکەنە ئیمامی خۆیان. ئەو

پێشنوێژەی نوێــژ بــە کەس ناکات شایستەی ئەوە نییە ببێتە ئیمام بێت. جیاوازیش لەنێوان ئیمام و ئەوەی دەبێت ئیمام بێت لای گەوێران شاراوە نییە. دەڵێن ئەوەیانە کە لەسەر چاکە و لە خواترسان و دووربوون لە گوناهـ و خراپە هاوکاریدەکرێت و لە سنووری فەرمانی خوادا بەگوێی دەکرێ و شمشێر لە دژی هەڵناکێشرێت، بەو مەرجەی بێفەرمانیی خوا نەکات. فەرموودەکانی پێغەمبەریش (د.خ) ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، هەروەک لەلایەن موسلم و بخارییەوە هاتووە، لە ئیبن عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت)، لە پێغەمبەرەوە (د.خ) کە فەرموویەتی: «هەرکەس لە میری خۆی شتێکی بینی بەدڵی نەبوو، با ئارامبگرێ لەسەری، چونکە هەرکەس بستێک لە ڕکێفی سوڵتان دەربچێتو بەو حاڵەوە بمرێت، ئەوا بە مردنێکی جاهلی دەمرێت». واتە ئەوەی خۆی لێ بەدوورگیراوە بریتی بووە لە دەرچوون لە دەسەڵاتی سوڵتان و جیابوونەوەی لە سەرجەم موسڵمانان. بۆیە فەرمایشیکردوە بە ئارامگرتن بەرامبەر بەو شتانەی لە میردا بەدڵمان نین. لێرەشدا باسی هیچ سوڵتانێکی دیاریکراوی نەکردوەو ناوی هیچ میر و کۆمەڵێکیشی نەبردووە» (١٤).

بەڵام ئیبن تیمیە پێیوانییە پێشەوا سەرچاوەی ڕەوایەتییە، بەڵکو کارکردن بە شەریعەت سەرچاوەی ڕەوایەتیە. هەروەها وتویەتی، تاقە فەرموودەیەکی

پێغەمبەر کــە ڕێگربێت لــە دەرچوون دژی پێشەوا، فەرموودەی (کوثر بن حکیم بن نافع)ـە، کە دروســتکراوە. هەرچی فەرمودە صحیحەکانیشە دەربارەی شەڕکردن لەگەڵ ئەوانەی لە ژێر ڕکێف دەرچوون، هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن کە دەبێت شەڕ لەگەڵ ئەوانە بکرێت کە لە شەریعەت دەرچوون، نەک ئەوانەی لە دژی پێشەوا دەرچوون. هەروەک دەڵێت: «بەڵام دەربارەی شەڕکردن لەگەڵ ئەوەی تەنیا لە فرمانی پێشەوایەکی دیاریکراو دەرچووە، لە هیچ دەقێکدا ئاماژەی بۆ نەکراوە». ئیبن تەیمیە تەنانەت پاســاوی بۆ دەرچوون لــە دژی پێشــەوای دادپەروەریــش هێنــاوتــەوە، ئەنجامی گومانپێکردن یان بەهۆی ڕاڤەکردنەوە، وەک چۆن مەعاوییەی کوڕی ئەبی سوفیان دژی عەلیی کوڕی ئەبی تالیب دەرچوو(١٥). ئەم هەڵوێستەی ئیبن تەیمیە بەهانەیە بۆ دەرچوون لە باری مێژووی ئیســلامیدا، کــە بووە هۆی دروستکردنی واقیعی دەوڵەتی ئیسلامیی پاش مەعاوییە. ئەو لێرەدا بەکردەوە بەهانــە و پاکانــە بۆ میرنشینیی دەستبەسەراگرتن دێنێتەوە، چونکــە دەرچوون تەنانەت ئەگەر ڕەتکردنەوەی میرنشینێکی باویش بێــت، بەهانــە بۆ دامەزراندنی یەکێکی تر لــە ڕێگــەی زاڵبوونــەوە - پاش دەرچوون بۆ بەگژاچوونەوەی لە ڕێگــەی هێــزەوە - دەهێنێتەوە.

ئاشــکرایە بەهانــە بەهــۆی جێمــاوە و کاریگەریی پاشەکییەوە بەجێدێت و ئەنجامەکەی کۆنترۆڵدەکات، چونکە ڕوونە کە ئیبن تیمیە دەرچوونی مەعاوییە دژی عەلی کوڕی ئەبی تاڵیبی تاوانباردەکرد، ئەگەر بهاتایە و عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب سەربکەوتایەو ئیبن تەیمیەش لە واقعێکی تردا بژیابایە، چونکە ئەوەی بەلای ئەوەوە گرنگ بوو، پاراســتنی یەکگرتوویی ئومەتی ئیسلام بوو، کە بەپێی شەریعەتی خوا دەچێتە ڕێوە.

فیقهی سیاسیی سونی پێش ئیبن تیمیە پرگماتیستانەتر بوو - ئەگەر دەربڕینەکە ڕاســت بێــت - بــۆ داننــان بەشــێوەیەکی هەمیشــەیی دەسەڵاتگرتنەدەستدا لە ڕێگەی زاڵبوونەوە، شان بەشانی هەڵبژاردن لەلایەن (ئەهلی حەل و عەقد)ەوە، واتە میراتگری. ئەوە جوینی (٤١٩-٤٧٨ک) بوو کە پاساوی بۆ پێشەوایەتیی دەسەڵاتدار یان سەرکەوتوو هێنایەوە، تەنانەت ئەگەر مەرجەکانی پێشەوایەتیشی تێدا نەبێت، مادام سەرکەوتووە و ناوی «والی»ی پێ بەخشی و مەرجی ئەوەی بۆ والییەکان داناوە کە ڕاوێژ بە زانایان بکەن. هەروەها ئیبن قدامە (٥٤١-٦٢٠ک) لە کتێبەکەیدا «**الكافي في تفسير ابن حنبل**»، چونکە هەریەکێک پێشەوایەتیی بە کۆدەنگیی موسڵمانەکان سەلما، ئەوا دەرچوون لە دژی و شەڕکردن لەگەڵیدا حەرامکراوە، وەک پێشــەوایەتیی ئەبوبەکری سدیق

یان بە ڕاسپاردنی لەلایەن پێشەوای پێش خۆیەوە، وەک ڕاسپاردنی عومەر لەلایەن ئەبوبەکرەوە، یاخود بە سەرکوتکردنی خەڵک هەتاکو ملی بۆ دەدەن و بە پێشەوا قبوڵیدەکەن، وەک عەبدولمەلیک کوڕی مەروان. لێرەدا ڕووبەڕووبوونەوەی دەرچوون و پێشەوایەتیی زاڵبوون بەڕوونی دەردەکەوێت و ئیبن قدامە دەرچوون لە دژی پێشەوایەتیی دەستبەسەراگرتن و زاڵبوون حەرامدەکات. یەحیای کوڕی شەرەف نوویش (٦٤١-٦٧٦ک) بەوپەڕی ڕاشکاوییەوە دانی بەوەدا ناوەو بەهۆی توندوتیژیی خودی حوکمڕانییەوە پاساو بۆ ملکەچکردن دێنێتەوە، واتە بە زوڵم پاساو بۆ ملکەچکردن بۆ زوڵم دێنێتەوە. هەتاکو لای بەناتی (١١٦٣-١١٩٤ک) هاوسەردەمی شێخ محەمەد کوڕی عەبدولوەهاب (١١١٥-١٢٠٦ک) زوڵمی هەرە گەورە دەبێتە دەرچوون دژی حوکمڕان. ئەوەی ئەو ڕاشکوییە وێنادەکات، ئەم دەربڕینەیە: «ئەوەی توندوتیژیی دژی خەڵک برەوبستێنێ دەبێت خەڵک ملکەچی بن». ئەمەش ئەو ڕستەیەیە کە دەگێڕدرێتەوە بۆ مەعاوییەو زانایانی ئایینی مالکی بەهۆیەوە گفتوگۆکەی خۆیان دەربارەی پێشەوایەتی پوختکردۆتەوە. هەروەها ماوردی ڕەوایەتیی بەخشیوەتە حوکمڕانیی بویهییەکان، بەدرەدین کوڕی جماعەش ڕەوایەتی بەخشیوەتە حوکمڕانیی مەمالیکەکان. ئەو دەربڕینەش لە پەراوێزی

چەندین ڕوونکردنەوەدا بەدیدەکەین، وەک پەراوێزی بناتی لە باسـکردنی زرقانیدا، پەراوێزی دسـوقی بۆ باسکردنی مەزن و زۆری تر.

ئەمەش نەریتێکە کوڕی عەبدولوەهاب پشتی پێ بەستووە، بەڵام بەشێوەیەکی ڕەها دەرچوون دژی خاوەن دەسەڵاتە حەرامدەکات، چونکە ڕەفتاری بەرامبەر بە موسڵمانەکان بە ڕەفتاری پێغەمبەر یان پەیامبەر بەرامبەر بە کافرەکان دەچێت، نەک ڕەفتاری زانا یان سەرکردەی سیاسی. لێرەوە، لەبەرئەوەی لە گۆشەنیگای خۆیەوە ڕەهاخوازانە لەسەرهەق بوو، بۆیە تەنانەت پاساوی بۆ بەکارهێنانی هێز نەهێناوەتەوە، بەڵکو هێزی بەکاریهێناوەو دەرچوون تەنانەت دژی حوکمڕانی ویلایەتەکانیشی حەرامکردوە: «پێمویە گوێدێری و ملکەچی بۆ پێشەوایانی موسڵمانەکان- چاکـەکـار و خراپەکارەکانیـان - پێویسـتە، ئەگەر فرمانی سەرپێچیکردنی خوایان دەرنەکردبێت. ئەوەی خیلافەتی خرایە ئەستۆ و خەڵک لەسەری کۆکبوون و پێی ڕازیبوون و بەشمشێرەکەی زاڵبوو بەسەریانداو بووە خەلیفە، پێویستە گوێدێریی بکرێتو دەرچوون دژی حەرامکراوە» (١٦). ئەگەرچی کوڕی عەبدولوەهاب لە حوکمڕانەکانی ڕۆژگارەکەی یاخیبوو، بەڵام تەنانەت ئاڕاستەکردنی ڕەخنە یان ئامۆژگاریی ئاشکرا بۆ والییەکانی لەسایەی ئەو

حوکمڕانییـــەدا حەرامکردبـــوو کـــە پشتگیریدەکرد، فرمانی ئەوەشی دەرکردبوو کە دەبێت ئاڕاستەکردنی ئامۆژگاریش پەردەپۆشکراوبێت. هەروەها گوێدێریی خاوەن دەسەڵات بە مەسەلەیەکی ڕەها دانا.

بەو جۆرە هەڵوێســتی گوێدێریی خاوەن دەســەڵاتەکان گـــۆڕا بـــۆ هەڵوێستێکی گشتیی موحافەزەکارانەو وای لە زۆرێک لە سەلەفییەکانی دەرچووی قوتابخانەی نەجدی «موەحەدون» یان «وەهابییەکان» کرد هەڵوێستێکی دوژمنکارانەیان، یان گومانکارانەیان، یاخود لـــە باشـــترین باردا خراپیان بەرامبەر بە شۆڕشەکانی عەرەب هەبێت. سەبارەت بە هەڵوێستی ڕەسمیی شانشینی سعودیش بەرامبەر بە شۆڕشەکان، ئەوا ئەو نەریتەی لە ڕەوتی چەند ســیاســەتێکی پرگماتیستانەی شانشینێکی موحافەزەکارانەدا- لە ڕووی سیاسیو کۆمەڵایەتیەوە- بەکارهێناوە کە پاساو بۆ سەقامگیریی دەوڵەتانێک دەهێنێتەوە نە دیموکراتین و نە ئیسلامی و دەرچوون لە دژیان ڕەتدەکاتەوە.

هێــزە موحافەزەکارەکانی لایەنگــری هـــەر ڕژێمێکی باو، دەرچوون لە دژی ئەو ڕژێمەیان بە ئاژەوە داناوە. ئاژاوەش چەند مانایەکی پێوانەیی نێگەتیڤ لەخۆدەگرێت، وەک پشـــێویی کۆمەڵایەتی و باری دوژمنایەتی توندوتیژو بەردەوامی نێوان چەندین گرووپی

دانیشتوان، بەواتای شەڕی ناوخۆ لە سەردەمەکەماندا. ئەمەش ئەوەیە کە هێزە موحافەزەکارەکان (بەواتای پاراستنی ڕژێمی باو) لە ســەردەمەکەماندا دەیکەن، چونکە هەر شۆڕشێک بەپێویست بە ئاژاوە دادەنێن... فەرهەنگی سیاسیی ئەو ڕژێمە عەرەبیانەی ڕووبەڕووی ڕاپەڕینەکان، یان شۆڕشەکان، یاخود بزووتنەوەکانی نارەزاییدەربڕین بوونەوە، پڕیەتی لە دەستەواژەکانی ئاژاوە، واتا وێناکردنی شۆڕش وەک ئاژاوە. هەروەها نموونە دەربارەی چەندین هەوڵدانی بەکردەوەی تێدایە بۆ وێناکردنی شۆڕش وەک ئاژاوە، یان تەنانەت گۆڕینی بۆ ئــاژاوە.

سەختە لە سایەی دوانەی دەرچوونو زاڵبووندا هیچ شێوەیەکی تیۆری شۆڕش بەدەستبێت، چونکە فیکری ئیسلامی فیقهی پاساو بۆ قبوڵکردنی سوڵتانی ستەمکار دەهێنێتەوەو ئەو دەرچوونە ڕەتدەکاتەوە، کە بە شۆڕشی چەکداری دژی ڕژێمەکانی ئەم سەردەمە دەچێت. دەشێت پاساو بۆ دەرچوون دژی ڕژێمێک بهێنرێتەوە کە شەریعەت جێبەجێناکات، یان فەرمانی سەرپێچیکردنی شەریعەت دەردەکات، بەڵام ئەوەی زاڵە پاساوهێنانەوەیە بۆ ڕژێمی باو، تەنانەت ئەگەر دەرچوونەکە بۆخۆی بووبێتە سیستەمێکی باو، واتە زاڵبووبێت. ئێمە بەرامبەر بە دینامیکییەتی دەسەڵات – ئۆپۆزسیۆن، یان حوکمڕانی– ئۆپۆزسیۆن نین، کە

مەسەلەکان و ناکۆکییەکانیان لە چوارچێوەی ڕژێمەکەدا چارەسەربکرێن، یان لە باری چارەسەرنەکردنیدا شۆڕش دژی ئەو ڕژێمە بەرپابکرێت و فیقهی ڕەخنەگرانە یان پاساوهێنەرانەی خۆ بهێنێتەدی، تەنانەت لە پاساوهێنانەوەدا بۆ دەرچوون ئێمە لەبەردەم هیچ جۆرێکی تیۆرەکانی شۆڕشدا نین.

## وشەی «شۆڕش»

**بەپێی (لسان العرب) وشەی** «الثورة: شۆڕش» لە (ثار الشيء ، ثورانا، تثور: هاج) **واتە (هەڵچوونی شتێک، هەژان و هەژاو: تێکرژان)ەوە هەڵهێنجراوەو هەڵچــوو: تووڕە و پڕدانیش: ڕاپەڕینە (١٧)... دەوترێت ئارامبە، هەتاکو ئەو هەڵچوونــە دادەمرکێتەوە، کە مانای «تێکرژان»ـە. شــۆڕش لە (لســان العرب)دا تێکرژانە، کە بێگومان مانای توڕەبوون لەخۆدەگرێت. گومانی تێدا نییە، سەرچاوەی دەستەواژەی «تێکرژانی عەرابی» لەگەڵ ئەوەی دواتــر ناوینرا «شــۆڕشی عەرابی»، لای عــەرەب نیزیکایەتییەکی واتاداریان هەیە. بەم واتایــە، شــۆڕش لە تێگەیشتنی عەرەبدا، ڕەهەندی توڕە و یاخی و تێکراژوی هەیەو هەمیشە کاتی بەخشینی ناوی شۆڕش بە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی- ســیاســی بەمێشــکدا هاتووە، هەتاکو ئێستاش لە کولتووری عەرەب و بەکارهێنانی میللیشــدا ڕەهەندی توڕەی هەڵچوو لە چەمکی شۆڕشدا هەیە. لەبەرئەوەیە لاوانی میســر لە ســەرەتادا کۆششەکەی خۆیان بە**

«کۆبەندیی لاوانی شۆڕشی تووڕەیی» ناونا. هەروەها توفیق حەکیم (١٨٩٨-١٩٨٧) لە کتێبی «**شۆڕشی لاوان**»دا جیاوازی لەنێوان شۆڕش و تێکڕژاندا دەکات، وەک هەوڵدانێکی زاراوەسازی بۆ لێک جیاکردنەوەی شۆڕش‌و تێکڕژان، بەو جۆرەش وشەکە ڕەگەکەی خۆی جێدەهێڵێ‌و ڕوودەکاتە زاراوەکە: «جیاوازیی نێوان شۆڕش و تێکڕژان ئەوەیە، تێکڕژان چاک و خراپ لە ڕەگەوە هەڵدەکێشێت، وەک ڕەشەبای تووڕە کە تەڕ و وشک پێکەوە لەناودەبات.. کەچی شۆڕش سوودبەخش دەهێڵێتەوە و هێزی لێ وەردەگرێت‌و تەنیا کۆنی ڕۆچووی ڕێگری زیندوێتی لەناودەبات...(١٨).

لێرەوە وشەی شۆڕش گرێدراوەتەوە بە بزووتنەوەی خێرای خرۆشاوەوە کە کاری ڕابوون، وەک بازدان و ڕاپەڕین و هەڵسان، لەخۆدەگرێت. هەروەها لێرەوە خەڵک وشەی «قەومە»یان وەک هێمایەک بۆ ڕاپەڕینی شارەکان بەکارهێناوە. بۆ نموونە، دەوترێت «قەومەی حەڵەب» ساڵی ١٨٥٠ دژی سەربازگیری و هەژاری، کە تیایدا هەژارەکان هێرشیانکردە سەر گەڕەکە دەوڵەمەندەکان‌و دەشێت لە ناوچەکانی تری شارەکانی وڵاتەکەمان پێی بوترێ شۆڕش. بە شۆڕشەکانی جوتیارانیش دەوترا «عامیە»و دەرکەوتووترینیان عامیەی کسرەوان بوو- بە سەرکردایەتیی تانیوس شاهین- لە چیای لوبنان،

ئینجا عامیەتەکانی چیای دروزەکان، لەکاتێکدا بە ڕاپەڕینەکانی شارەکان دەوترا «قەومە»و دیارترینیان قەومەی حەڵەبی ساڵی ١٨٥٠ بوو، کە نموونەی ئەو جۆرە «شۆڕش»انەی شارەکان لە سەدەی نۆزدەهەمدا دەخاتەڕوو(١٩). توندوتیژیی میللیش لەو کاتەدا، مەیلی هێرشکردنە سەر دوکان و ماڵەکانی کەمایەتییە ئایینیەکانیشی لەخۆدەگرت.

عەبدوڵڵا عەرەوی لە «**مجمل تاريخ المغرب**»دا باسی ئەو کۆمەڵە جیهادکەرانە دەکات، کە لە نیوەی دوەمی سەدەی نۆزدەهەمدا لەنێوان تونس و جەزائیرو لیبیادا هاتوچۆیانکردوە و هێما بۆ ئەوە دەکات، ناوچەکانی ناوەوەی مەغریب بۆ ماوەیەکی درێژ نەکەوتونەتە ژێری باری داگیرکردنەوە. ئەو پێیوایە، بزووتنەوەی محەمەد کوڕی عەبدولکەریم خەتابی، جەنگێکی جیهادکارانەیە و بە «جەنگی لادێ» ناویدەبات. هەروەها باسی بزووتنەوە تیرەگەرییەکانی پێشوو دەکات، کە ناوی شۆڕشیان بەسەردا دابڕابوو، وەک «شۆڕشی کوڕی غیزاهم» لە تونس (١٨٦٤)، یان «شۆڕشی موقرانی» لە جەزائیر (١٨٧١)و لەو بڕوایەدایە، کە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەوانو بزووتنەوەکەی عەبدولکەریم خەتابی بەشێوەی ئێستای، واتە وەک شۆڕشەکانی سەدەی بیستەم، بەری پیادەکردنی ئاقارێکی نوێیە: «پشتگیریکردنی

شۆڕشی لادێ لەلایەن بزووتنەوەی سۆشیالیستیی جیهانییەوە ڕەنگێکی وەهای بەو شۆڕشە بەخشی کە زۆر لە شـۆڕشـەکانی ئاسـیا و ئەمریکای لاتین نزیکیـان خسـتەوە، کەچی نووسـەرانی مەغریب سوورن لەسەر ئەوەی، هاوکاتیی خۆبەدەستەوەدانی سەرۆکی گوندی (١٩٢٦) و سەرەتای ناڕەزاییەکان بەرامبـەر بـە داگیرکردنی زەوییـەکانی دەوروبەری مکناس و تادلا لەلایەن ئاوەدانکەرانەوە... شۆڕشی لادێی کردە ڕووداوێکی هاوچەرخی ناو ناخی سەدەی بیستەم. ئایا ئەمە ڕاستە؟ ئایا شیکردنەوەکە لەگەڵ گەشەکردنی مێژووییـدا ڕێـدەکات، یـان بە چەنـد ئامرازێکی زۆر ژیرانە بەلاڕێیدا دەبات؟ ئەگەر ئەوە بەکردەوە ڕاست بێت، ئایا هیچ مانایەک دەمێنێتەوە بۆ لێک جیاکردنەوەی بەرگریکردنی خۆڕسـکانە و بەرگریکردنی نیشـتمانیی نـوێ؟»‌. بۆیە عەرەوی پێی باشـترە شـۆڕشی لادێ، وێڕای ئەو خەسڵەتە سەردەمیانەی تیایدایـە، بخرێتـە چوارچێوەیەکی تەقلیدییەوە. مەبەستیشی لە تەقلیدی «چوارچێوەی ناوچەیی شاخاوی گوندییە» (٢٠)، کە لـە بـاری شۆڕشێکی بەردەوامدا بوو دژی داگیرکردن.

ئێمەش پێمانوایە پرسیارکردنەوەکانی عەرەوی لەجێی خۆیاندان و قسەکانی بۆ زۆربەی ئەوانە ڕاستن کە پێیاندەوتـرێ شـۆڕشـەکانی سەدەی بیستەم و

مانای نوێی شــۆڕشــیان پێ بەخشرابوو، لەکاتێکدا ئەوانە زیاتر لە مانای پیت بەپیتی شــۆڕشــەوە (واتە تێکرژان) نزیکبوون.

بــەڵام ئــەوەی تێگــەیشــتنی ســەختــە، پرسیارکردنەوەیەکی گومانکارانەیەو لەناو ئامرازەکانی ڕاگەیاندندا دەربارەی شۆڕشە عەرەبییەکانی ئێستا بڵاوە و بەشێوەیەکی تایبەتی ڕۆشنبیریانێکی عەرەب دەیوروژێنن، کە ڕۆژانێک چەپڕەو بوون و هەتاکو ئێســتا هەندێک لە کەرەســتە زاراوەسازییەکانی چەپیان بەدەســتەوەیە. ئەوانــە، لەبەر هۆکارێکی دیاریکراو، پێیانوایە شۆڕشەکانی عەرەب شایستەی ئەوە نین وشەی شۆڕشیان پێ ببەخشرێت، چونکە نەزانن یان خۆیان گێل دەکەن بەرامبەر بە مانای ئەو وشە عەرەبییە نیمچە سادەیەی شۆڕشەکانی عەرەب لە ڕووی سیاسی و ژیوارییەوە تێیان پەڕاندووە. ئەوانە تەنیا ئاشــنان بە چەند شۆڕشێکی تایبەتی، وەک شۆڕشی ئۆکتۆبەر و شۆڕشی فەڕەنسی. شۆڕشەکانی عەرەبیــش نزیکتــرن لە شــۆرشــی فەڕەنسییەوە، ئەگەرچی لە شــۆڕشی فەڕەنسی میللیترن و لەویش کەمتر پۆپۆلیستانەن.

گشــت خراپــە و چاکەکــانی بزووتنــەوەی گۆڕانکاریی ئێســتای نیشــتمانی عەرەب، ئەنجامی دەستەبژێرنەبوونیەتی. مەبەست دەرچوونی چەندین

کەرتی فراوانی میللەتــە بۆ نــاو فەزای گشتی، واتە بۆ ناو ســیاسەت. بەشداریکردنی میللیی عەرەب لە شۆڕشەکاندا، بــەراورد بــە هەر شۆڕشێکی مێژووی ناودار، بەشــداریکردنێکی فراوانــە. کەچی هەندێک ڕووناکبیر هەڵوێستی خراپیان بەرامبەر بە شۆڕشەکانی عەرەب هەیــە. هەندێک لەوانە هەڵوێستی خراپی خۆیان بەرامبەر بە بزووتنەوەی میللەت ئاشکراناکەن، بەڵکو چەمکی شۆڕش دەکەنە چەمکێکی باڵاڕەوی بڵندیخــواز (تەنانــەت شــاعیرانە)، یان چەمکێکی کۆمەڵناســانەی پێشــوەخت دەســتنیشــانکراو و بزووتنەوەی گۆڕانکاریخوازی میللیی عەرەب بەپێی ئەو چەمکە داوەریدەکەن، کە بەری خەیاڵی خۆیانە و «ئیلهام»ی لە شۆڕشەکانی ترەوە وەرگرتووە.

## شۆڕش، کودەتا، ڕیفۆرم

لەگەڵ ئەوەدا و بەهۆی هەموو ئەوانەوە، پێویستە هەوڵبدرێت سنووری چەمکە هاوچەرخەکە، لانی کەم لە بواری سیاسیدا، بەوردی دیارییبکرێت، بەجۆرێک کە دیاریکردنێکی ئایدیۆلۆژیانەی وەها نەبێت شۆڕش بکاتە مەسەلەیەکی باش یان خراپ، یاخود شۆڕش ببێتە پشێوی و ئاژاوە و مەترسییەک بۆ میللەتەکان و مرۆڤایەتی. مەبەست لە شۆڕش، **جوڵانەوەیەکی میللیی فراوانە لە دەرەوەی بونیادی دەستووریی باو یان لە دەرەوەی ڕەوایەتی، ئامانجی گۆڕینی سیستەمی حوکمڕانیی باوە لە دەوڵەتدا.** شۆڕش بەم مانایە، بزووتنەوەیەکە ئامانجی گۆڕینی ڕەوایەتیی سیاسیی باوە، کە بڕوای پێی نییە و گۆڕینییەتی بە ڕەوایەتیەکی نوێ.

ئەم پێناسەیە بە عەرەبیی سەردەمەکەمان شۆڕش لە کودەتای سەربازی جیادەکاتەوە، چونکە ئەمەی دوایی بەپێویست تاودەرەوەی بزووتنەوەیەکی میللی نییە، ئەگەرچی دەشێت کودەتایەکی سەربازی،

کە ئامانجی گۆڕینی سیستەمی حوکمڕانییە، لەلایەن میللەتەوە پشتگیری بکرێت. هەروەها شۆڕش لە ڕاپەڕینی نارەزاییخوازانەی میللەت یاخود یاخیبوونە جۆربەجۆرەکان جیادەکاتەوە، کە مەسەلەی گۆڕینی سیستەمی حوکمڕانی دەرنابڕن.

جیاوازییەکی زمانەوانی لەنێوان هەردوو وشەی «کودەتا»و «شۆڕش»دا هەیە. کاتێک لە ڕێگەی (لسان العرب)ەوە دەگەڕێینەوە بۆ مانای عەرەبیی شۆڕش، دەبینین دەرەنگ وەختانێک نەبێت واتای (Revolution)ی نەداوە و وشەکە لە مێژووی عەرەبدا، بەپێی ڕەچەڵەکی زانستی یان ڕەهەندە کولتووری و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان، هەمان واتای (Revolution)ی نەبووە، بەڵکو مانایەکی سنوورداری هەبووە، ئەویش «تێکڕژان» یان «هەڵسان» بووە. سەیر ئەوەیە وشەی «کودەتا»، بەواتای گۆڕان، تەنانەت لە ڕەچەڵەکە زمانەوانییەکەیدا، نزیکتربووە لە چەمکی شۆڕش، کە لە سەردەمەکەماندا بەکاردەهێنرێت.

ئەوەی لێرەدا سەرنجڕاکێشە، تورکو فارسەکان بۆ گوزارشتکردن لە «شۆڕش» بەواتا کۆمەڵایەتیو سیاسییەکانی، کە مانای گۆڕانکاریی ڕیشەیی و گواستنەوەیە لە بارێکەوە بۆ یەکێکی تر (بۆ نموونە لە حوکمڕانیی سوڵتانییەوە بۆ حوکمڕانییەکی دەستووری)، وشەی «ئینقیلاب»ی عەرەبییان بەکارهێناوە. بۆیە

دەوترێ: «ئینقیلابی دەستووری»، واتە «شۆڕشی دەستووری»و «ئینقیلابی ئیسلامی»، واتە «شۆڕشی ئیسلامی». فارس و تورکەکان وشەی «ئینقیلاب»ی عەرەبیان بەواتای شۆڕش بەکارهێناوە، چونکە لە وشەی شۆڕش زیاتر مانای گۆڕینی سیستەمی سیاسی دەدات، کە واتای باری تێکرژان و تورەیی دەدات. پێدەچێت فارس و تورکەکان لە شوێنی گونجاو و بەمانای گونجاو وشەی «ئینقیلاب»یان بەکارهێناوە، لەکاتێکدا عەرەب بەمانا ڕێژەییەکەی ئەو وشەیەیان بەکارهێناوە و زیاتر لە «کودەتای سەربازیدا» قەتیسیانکردوە! بۆیە وەک چەمکێکی نێگەتیڤ هاتۆتە ناو زمانی عەرەبییەوە، چونکە مانای ڕووخاندنی ڕژێمی حوکمڕانی بووە، بەو واتایەی لە نیوەی دوەمی سەدەی بیستەمدا بڵاوبووە، ئەویش کودەتای سەربازی بووە.

لەوەی پێشەوە دەگەینە ئەو سەرەنجامە، کاتێک دوور لە وردبینیی زانستیانە دەستدەکەین بە گۆڕینی شۆڕش، لە دەستەواژەیەک یان وشەیەکەوە کە وەسفی چەند دیاردەیەکی جیاواز یان هاوشێوە دەکات، بۆ زاراوەیەکی چەمکئاسای وەها کە چەندین بیرۆکە بەرهەمدێنێ یان نێوانکاریی دەکات بۆ بنیاتنانی تێگەیشتنەکانی، ئەوا بە پێویست ئەرکی سەر شانمانە لەو دیاردانەی جیابکەینەوە کە زۆر لێوەی نزیکن. مەبەست ئەو دیاردانەیە کە بایەخدەدەن بە گۆڕینی

سیستەمە سیاسییەکان، یان ئەو بزووتنەوانەن کە دەبنە مایەی ئەو گۆڕانکارییە. لە ڕوانگەی کۆمەڵناسییەوە، دیاردەکە کۆمەڵایەتیانەیە و لە ڕێگەی کاری کۆمەڵایەتییەوە پەیوەندیی بە گۆڕینی سیستەمی سیاسییەوە هەیەو بەتەنیاو دابڕاو لەوانیتر لەئارادانابێت. لێرەوە، شۆڕش لە ڕیفۆرم (Reformation)، کودەتای سەربازی، بزووتنەوەکانی یاخیبوون، ملنەدان و ڕاپەڕینەکان جیادەکینەوە. ئەوانەش چەند دیاردەیەکی تێکهەڵکیشن و دەشێت یەکێکیان ببێتە هۆی سەرهەڵدانی ئەویتر. لەوانەیە یاخیبوونی میللی ببێتە هۆی کودەتا لەناو ڕژێمداو یاخیبوونیش ببێتە مایەی ڕیفۆرم لەناو ڕژێمدا، پێچەوانەکەش هەر ڕاستە.

بیرۆکەی ڕیفۆرم، لە بزووتنەوەی ڕیفۆرمی ئایینی پرۆتستانتیی سەدەی شانزەهەمەوە هاتووە. ئاشکرایە بزووتنەوەی ڕیفۆرمی ئایینی بووە هۆی چەندین ململانێ و جەنگی مەزن لەناو ئەورووپای مەسیحیی کاسۆلیکی لەو کاتەدا و ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانیی پیرۆزی تێکشکاند و هەردوو دەسەڵاتی پاپاو ئیمپراتۆری ناچارکرد دان بنێن بە کڵێسا نەتەوەییە نوێکان یان سەربەخۆکاندا. دیارترینی ئەو جەنگانە، جەنگی سەد ساڵە و دواتر جەنگی دە ساڵە بوو. مەبەست لە ڕیفۆرمی ئایینیش لەو کاتەدا، ڕیفۆرمی

کڵێسا و چاککردنی تێڕوانینی بوو بۆ پەیوەندیی نێوان خوا و تاکی ئیماندار. بەوپێیەی ڕیفۆرم جەغتی لەسەر یەکسانیی نێوان تاکەکان لەبەردەمی خوادا دەکردەوە، بۆیە نەدەکرا کەسێک خۆی بکاتە ڕایەڵەی نێوان خوا و ئیماندارەکان. ئەمەش پێگەی ئایینی سیاسی و کۆمەڵایەتیی پیاوانی ئایینی ڕەتکردەوە و پەیوەندیی نێوان دەوڵەت و کڵێساشی لەقاند.

دواتر جارێکی تر وشەی ڕیفۆرم هاتەئاراوەو لەگەڵ بزووتنەوەی سۆشیال دیموکراسی و بزووتنەوەی کرێکاران لە ئەوروپا و سەرهەڵدانی بژارەکانیان لەنێوان ڕیفۆرم و شۆڕشدا بەتەواوەتی چووە ناو زانستی سیاسییەوە. ناونیشانی وتارەکەی ڕۆزا لۆکسمبۆرگیش (١٨٧١-١٩١٩) بۆ بەرپەرچدانەوەی هەڵوێستەکانی ئیدوارد برنشتاین (١٨٥٠-١٩٣٢) لێرەوە سەرچاوەدەگرێت. وتارەکە ساڵی ١٩٠٠ لە ژێر ناونیشانی «**شۆڕش یان ڕیفۆرمی کۆمەڵایەتی**»دا (Sozial- Reform oder Revolution) بڵاوبۆوە. برنشتاین، کە لە لەندەن هاوەڵی مارکسو ئەنگڵز بوو، لە هەردوو ساڵی ١٨٩٦و ١٨٩٨دا زنجیرەیەک وتاری لە ژێر ناونیشانی «**مەسەلەکانی سۆشیالیزم**»دا بڵاوکردەوە و دواتر لە ساڵی ١٨٩٩دا کتێبی «**بنەماکانی سۆشیالیزم و کارەکانی سۆشیال دیموکراسی**» بڵاوکردەوە. ئەو وتارانە گفتوگۆکانی

ڕاستکردنەوەخوازی (Revisionism)ی بەناوبانگ لەناو مێژووی سۆشیالیزمدا دەستیپێکرد (کە لەلایەن کۆمۆنیزمەکانو دار التقدمەوەو وەک جۆرێک لە بەدگۆیی بە «شێوێنەران» ناونرا). ئەم مشتومڕە گوزارشت بوو لەو قەیران یان گێژاوەی بزووتنەوەی کرێکاران تێیکەوتبوو و بریتی بوو لە: ڕەقهەڵاتنی مەیلی مێژووکردخوازی، بەهۆی زیادبوونی ڕادەی جەمسەرگیریی کۆمەڵایەتی ئابووریی نێوان هەردوو چینی سەرمایەداری و کرێکارانی پیشەسازی، سەرهەڵدانی چینی ناوەڕاست لەناو چوارچێوەی سیستەمی سەرمایەداریدا و دەستدانی گۆڕانکاریی وردەوردە لە چوارچێوەی سیستەمی سەرمایەداریی باودا لەپێناو گرتنەئەستۆی داخوازییە سەندیکاییەکانو مافە کریکارییەکاندا (سوشیالیزم). ئەمەش ڕێگەیەکی دڵنیاترە لەو شۆڕشانەی دەرفەتەکانی بەرپابوونیان لەناو سیستەمە سەرمایەدارییە پێشکەوتووەکاندا کەمبۆتەوە، بەپێچەوانەی چاوەڕوانییەکانی کارل مارکسەوە. ئەمە ڕای ئیدوارد برنشتاین بوو دژی کارل کاوتسکی (Karl Kautsky) و ئۆگست بیبل (August Bibel) و کارل لیبخنت (Karl Liebknecht)و سەرکردە مێژووییەکانی تری سۆشیال دیموکراسیی ئەڵمانی. ئەم ئیشکالیەتەش- بەشێوەیەکی گشتی- هانی ئەوەی دا بزووتنەوە کرێکارییەکان دابەشبن بۆ چەندین حیزبی

کۆمۆنیستی و سـۆشـیال دیموکـرات. ئەوەش ئەو گفتوگۆیە بوو، کە لەناو ڕێکخراوی حیزبە کرێکارییەکاندا (ئینتەرناسیونالیزمی دوەم) ڕووی داو برنشـتاین سەرکردایەتیکرد، ئینجا کاوتسکی شوێنپێی هەڵگرت و پاش چەند ساڵێک کەوتە بەر تانەوتەشەرە توندوتیژە بەناوبانگەکەی لێنین. لێرەشدا لێنین سەرکردایەتیی ئۆردوگای بەرامبـەری کـرد و ئینتەرناسیونالیزمی سـێیەم (کۆمێنترن)ی لە سـاڵی ١٩١٩دا دامەزرانـد. لێرەوە ڕووبەڕووبوونەوەی نێـوان ڕیفۆرمیسـتەکان (جۆرەکانی سۆشیالیزم)و شۆڕشگێرەکان (جۆرەکانی کۆمۆنیستەکان) سەریهەڵدا.

هیچ پاسـاوێک لەئـارادانییـە بـۆ ئـەو ڕووبەڕووبوونەوەیەی نێـوان ڕیفـۆرم و شـۆڕش – وەک دوو لێکدژ – کـە بووە مایەی دوژمنایەتی لەناو مارکسیزمدا و لە سـەردەمی ئێسـتاماندا بۆتە گفتوگۆیەکی پەراوێزکەوتوو. چونکـە وەک دواتـر دەرکەوت، شۆڕشگێڕ دەبێت ڕیفۆرمیست بێتو لەکۆتاییدا سەرکردایەتیی ڕیفۆرمێک بکات، ڕیفۆرمیستیش دەشێت سەرکردایەتیی گۆڕانکارییەکی شۆڕشگێڕانە بکات. ئەو شۆڕشگێڕەی ڕیفۆرم و هەموو ئەوانە ڕەتدەکاتەوە کە دامەزراون، زۆرجار لەئاکامدا دەگاتە ئایدیۆلۆژیایەکی سەرتاپاگیر و ستەمکارییەکی شـێوە نوێ، یان هەڵوێستێکی موحافەزەکارانەی

دژی شـۆڕشــی دەبێــت، ئەویش ڕووەکــەی تری هیچگەراییــە (نەهلیــزم). لە سەدەی نۆزدەهەمی ئەوروپادا ئەڵتەرناتیڤێکی تریش هەبــوو، ئەویــش ئاقاری ئەنارشیزم بوو، کە گرێدراوی ناوی تیۆریستو شۆڕشگێڕی پیشەکار میخائیل باکۆنین (١٨١٤-١٨٧٦) بوو. لێرەدا شۆڕشی ڕووت دەبینینەوە، کە بەرەو بژارێک دەچێت هەموو سیستەمێک لە حوکمڕانیدا ڕەتدەکاتەوە، چونکە سەرکوتکەرانەیە.

سەبارەت بە ڕیفۆرمیش، دەشێت بەلاڕێدابردنو ســاختەکردن بێت بۆ پاراســتنی حوکمڕانی، وەک ئەوەی لە هەندێک دەوڵەتی عەرەبــی ڕوودەدات، کاتێک ڕیفۆرم تیایاندا بەکاردەبرێت بۆ هەڵمژینی توڕەیی جەمــاوەر و تەنیــا چەنــد دامەزراوەیەکی پەراوێزخراوی دەرەوەی دامەزراوەکانی بڕیارسازی دەگرێتەوە، یان دەبێتــە ئاخاوتنێکی گوتارئامێز بۆ تێپەڕاندنی قەیــران. لەگەڵ ئەوەشــدا، ئەگەر ڕیفۆرم ڕیشەیی بێت، ئەوا بێگومان بەرەو پڕۆسەی گۆڕانکاری دەچێت.

هەر ڕیفۆرمێکی جیدی لە بنەڕەتدا بیرۆکەی گەڕانەوەیەکی دیاریکراو بۆ ڕیشە بنچینەییەکان یان ڕەچەڵەکەکان لەخۆدەگرێت و دابونەریتە باوەکان تەنیا بە لێکدانەوەی ئەو ڕەچەڵەکانــە دادەنێت. کاتێک لە ڕوانگەی ڕیفۆرمخوازانەوە ئەو دابونەریتانەی

لەو ڕەچەڵەکانەوە هەڵهێنجراون بەڕادەیەک تووشی ڕەقهەڵاتن دەبن، کە ناکۆک دەبن بە ڕەچەڵەکەکەو دەیشێوێنن، ئەوا دەبێت ڕەتبکرێنەوە و ڕووبکرێتەوە بنچینەکان بۆ دامەزراندنی نەریتێکی نـوێ لە ئەو ڕێگەی ڕەچەڵەکانەوە. واتە هەر ڕیفۆرمێک- بەیەکێک لە ماناکان- جۆرێک لە ڕەچەڵەکخوازی لەخۆدەگرێت، چونکە دژی بنچینەکان نییە، بەڵکو دژی بارودۆخی باوەو بانگەشەی ئەوە دەکات کە ئەو بارودۆخە باوە تەبانییە لەگەڵا تێگەیشتنی ڕاستی بنچینەکاندا.

ئەمەش سەبارەت بە بزووتنەوەکانی ڕیفۆرمی ئاینی پرۆتستانتیانە و بزووتنەوەی ڕیفۆرمی ئیسلامی لە سەدەی نۆزدەهەمدا ڕاستەو دەشێت ناڕاستەوخۆش بۆ سیاسەت ڕاست بێت، چونکە ڕیفۆرمی سیاسی ئەو بنچینانە ڕەتناکاتەوە کە سیستەم لەسەریان دامەزراوە، بەڵکو ڕیفۆرم بونیادە سیاسییە پەککەوتووەکان بە لێکدانەوەی هەڵەی ئەو بنچینانە دادەنێت. لێرەوە ڕیفۆرم دەگەڕێتەوە بۆ قۆناغی دامەزراندنو ڕاگەیاندنی دەوڵەت، یان یەکەمین بەرنامەی حیزبی حوکمڕان، هەتاکو باسی ئەوە بکـات سـیسـتەم لەو بنچینانە لایداوە کە بۆی دانراون. هەروەها هەمیشە ڕووبەڕووی فیکرێکی پاساوکارانە یان تێگەیشتنێک دەبێتەوە کە داکۆکی لە بونیادە باوەکان دەکات، وەک ئەوەی ئەوانە ڕەچەڵەک بن. بۆ نموونە، لە باری بزووتنەوەی

سۆشیالیستیدا، بزووتنەوەکانی ڕیفـۆرم لــە ئاقاری سۆشیالیستیدا شۆڕشی پڕۆلیتاری تەنیا بە ئامڕازێک دادەنێن و پێیانوایە نابێت بە بت بکرێت و دەکرێت بە گەڕانەوە بۆ ڕەچەڵەکەکانی فیکری سۆشیالیستی - خۆی لە دادپەروەریدا دەبینێتەوە - بەچەندین شێوازی تری دوور لە شۆڕش ئەوە بەدەستبێت، کە گونجاوە لەگەڵ دادپەروەریی کۆمەڵایەتیدا و ناکۆک نییە لەگەڵ دەستکەوتە سەردەمییەکانی تر، وەک مافە شارستانیەکان و ئەوانیتر.

لەکاتێکدا شــۆڕش پێیــوایە، ڕیفــۆرم لە چوارچێوەی سیستەمی باودا دەست نادات و پێویستە ســیســتەمەکە بەتەواوەتی بگۆڕێت و سیستەمێکی نوێی وەها دابمەزرێنرێت، کە لەسەر بنچینەی نوێ ڕادەوەســتێت. بێگومــان ئەمــەش جیاوازیکردنێکی پێناسەئاسای چەمکئاسایە، واتە لە پێناسەکەمانەوە بۆ وشەکە وەک زاراوە سەرچاوەدەگرێت و پێناسەکەش یارمەتیماندەدات دیاردەکان لێک جیابکەینەوە.. بەڵام ماناکە لە واقیعدا بەو شێوەیە نییە، چونکە شۆڕش - وەک بینیمان - ئامانجی گۆڕانکاریی ڕیشــەییە و ئەو دروشمە بەرزدەکاتەوە، بەڵام دەشــێت ئەویش بە پرۆسەیەکی ڕیفۆرمخوازانە کۆتایی بێت، کە پێیوایە تەواو نوێیە و بەشــێکە لە ســیســتەمی باو و لەگەڵ ڕەچەڵەکە گریمانەکراوەکانی ســیســتەمەکەدا ناکۆک

نییە. بێگومان لێرەدا، بۆ دوورکەوتنەوە لە ناکۆکییەکانی زاراوەکە و قوتارکردنی بەکاربوونی، ئەوەی سوورە لەسەر پێناسەکردنی شـۆڕش بەشێوەیەکی ناکۆک لەگەڵ ڕیفۆرم پەنادەبات بۆ وتنی: «ئەو شۆڕشەی دەبێتە مایەی ڕیفۆرمی سیستەم، شۆڕشێکی کامڵ نییە»، یان «شۆڕشێکی ڕاستەقینە نییە»، دەشکرێت حوکمی ئەوەی بەسەردا بدرێت، کە لە بنەڕەتدا شـۆڕش نەبووە. بەڵام ئەم گفتوگۆ تێرمینۆلۆژییەی دوایی دەربارەی پێناسـەی «ڕاستەقینە» و چەمکی «ڕاستەقینە»و «ناڕاستەقینە» لە ڕووی پراکتیکیو زانستیشەوە بێسوودە.

بەهەرحاڵ، سەختە ئەوە قبوڵ بکرێت کە هەر ڕیفۆرمێک گەڕانەوە بۆ ڕەچەڵەکێکی دیاریکراو لەخۆدەگرێت، هـەر شۆڕشێکیش بەپێویست ئەو ڕەچەڵەکانە لەخۆناگرێت. بەوپێیەی لە هەر ڕیفۆرمێکی جیدیدا چەند توخمێکی شۆڕشگێڕانە هەن، لە هەر شۆڕشێکیشدا کە قایل نابێت بە وێرانکردنو پشێویو سەرقاڵی بنیاتنانە چەند توخمێکی ڕیفۆرمخوازانە دەبینینەوە، چونکە زۆرجار «چەند ڕەچەڵەکێکی تر»ی سـیسـتەمی بـاو دەژێنێتـەوە کـە کاتی حوکمڕانیکردن یـان بنیاتنانی دەوڵەتی نیشتمانی پشتیان پێ دەبەستێت.

دەربارەی کودەتـاش، ڕوونـە مەبەسـت لێی

ئەوەیە کە لەســەر دەستی بەشێک لە دەستەبژێری حوکمڕان، یان بەشێک لە دامەزراوە حوکمڕانەکان، لەوانە سوپا یان بەشێک لە سوپا، ڕوودەدات و دەبێتە مایەی دابەشکردنێکی نوێی دەســەڵات لەناو خودی ڕژێمەکەدا، بەڵام مێژوو بەتاڵ نییە لەو کودەتایانەی بژارە سیاسییەکان ناچاریانکردون گۆڕانکاریی ڕیشەیی لە ڕژێمدا بهێننەدی، بۆیە ناونراون یان ناوی خۆیان ناوە «شۆڕشەکان».

دۆخەکە لەبــاری یاخیبــوون و ملنەدان و ڕاپەڕینەکاندا ئاســانترە، چونکــە ئێمە لە سەرەتاوە مامەڵە لەگەڵ چەند بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتیی فراوان دەکەین، کە لەسەر بنچینەی ڕەتکردنەوەی چەند سیاسەتێکی دیاریکراو بەرپابوون، یان ناڕازین بەرامبەر بە چەند سیاسەتێک، یان کەموکوڕییەک، یاخود زۆرداریيەکی دیاریکراو لە ڕژێمدا. یاخیبوون یان ملنەدان لەپێناو داواکردنی گۆڕینی ئەو سیاسەتانەدا دەستپێدەکەن و لەوانەیە فراوان و توندوتیژیش بێت. ئاشکرایە لەوانەیە ملنەدان سنووری خۆی ببەزێنێ، ئەویش کاتێک داواکارییەکەی دەگاتە ڕادەی داوای گۆڕینی سەرتاپای ڕژێمەکە، یان لەبەرئەوەی ڕژێم ئەو گۆڕانکارییە ڕێژەییەی ڕەتکردۆتەوە کە یاخیبووان داوایدەکەن، یاخود لەبــەر ئەوەی یاخیبووەکان هەستیان بە هێز کردوەو سووربوون لەسەر هەنگاونان

بەرەو شۆڕش. لێرەدا ئێمە باسی دیاردەیەک دەکەین کە سەربەخۆیە، یان باسی یەکێک لە قۆناغەکانی شۆڕشی سیاسی دەکەین.

شۆڕشەکان- بەم مانا جیاکارەیە- دیاردەیەکی ڕادیکاڵانەی نوێن، چونکە لەسەر بنچینەی نوێ و نوێکردنەوە هەڵدەگیرسێن و بەدوای نوێبوونەوەدا دەگەڕێن و خۆیان بە نوێبوونەوەخواز دەزانن، ئەمەش بەپێچەوانەی ئەوەی فەیلەسووفەکانی یۆنان ناویان نابوون شۆڕشەکان، چونکە لای ئەوان شۆڕشەکان سوڕی دووبارەی گۆڕینی ڕژێمەکان بوون، تەنانەت کاتێک شۆڕشەکان دەبنە مایەی گۆڕینی ڕژێمیش، جوڵانەوەیەکی بازنەیی لە هەڵکشان و داکشانی ڕژێمی دیاریکراو پێکدێنن، بەبێ ئەوەی هیچ نوێییەک لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بێتەئاراوە. پێدەچێت ئەمە بنەڕەتی بەکارهێنانی وشەی (Revolution) بێت، بۆ گوزارشتکردن لە ڕێڕەوی جوڵانەوەی هەسارەکانو تیایدا گەڕانەوەیەکی ئەبەدی بۆ هەمان خاڵی هەنگاوهەڵهێنان لەئارادایە. ئەمەش ئەو لێکدانەوەیە نییە کە لە ڕووی فەلسەفییەوە «پێشبڕکێکار»انەیەو لە ڕووی دارشتنەوە وێناکارانەیەو حەنە ئارندت خستویەتیە ڕوو بۆ ناونانی شۆڕش، وەک گوزارشتکردنێک لە حەتمیبوونی سەرکەوتن، کە بە حەتمیبوونی جوڵانەوەی هەسارەکان دەچێت.

## نویّ و نویّبوونەوە

دەکریّت بوتریّت، هەردوو توخمی نویّ و ڕادیکالّیبوونی شۆڕش و قبولّنەکردنی دەسەلاّتیّک لە سەروو دەولّەت و کۆمەلّگەوە کە پاساو بۆ سیستەمی سیاسیی باو دیّنیّتەوە، چەند مەسەلەیەکی عەلمانیی نویّن (٢١)، تەنانەت ئەگەر بەشیّوەیەکی ئایینیش داڕێژرابنەوە. شۆڕش ڕەتکردنەوەی بوونی پاساوگەلی نەگۆڕ بۆ ڕژێمی باو لەخۆدەگریّت، شۆڕشی نویّش سیستەمیّکی قوچەکیی وەها قبولّناکات کە بەشیّوەی مەسەلەیەکی پیرۆز خرابیّتەڕوو، وەک ئەو سیستەمەی جیاوازیی نیّوان حوکمڕان و حوکمڕانیکراوەکان لە ڕووی ناوەڕۆکەوە بە دەرهاویشتەیەکی سروشتی یان سیستەمیّکی پیرۆز دادەنیّت، کە لە سیستەمی خواوەندەوە بۆ گەردوون سەرچاوەیگرتووەو دەق و فیّرکاریگەلیّک دەیپاریّزن دامەزراوەی ئایینی لیّکدانەوەیان بۆ دەکات. پیّدەچیّت– لە سەرەتاوە– ئەم بڕیاردانە مانای ئەوە بیّت، شۆڕشە ئایینیەکان شۆڕش نەبوون. لەڕاستیدا ئەوە مانای ئەوەیە،

یاخیبوونە مێژووییەکانی پێش مۆدێرنیتە شۆڕش نەبوون، وەک لە شــۆڕشی فەرەنسی بەدواوە لە مانای شۆڕش تێدەگەین، جا ئەو یاخیبوونانە خاوەن گوتاری ئایینی بووبن، یان نائایینی. بەهەرحاڵ، پێڕەوکارانی ئەوانە ناوی تریان لێ ناون، کاتێکیش ناوی شــۆڕشـیان پێ بەخشراوە، مەبەست لێی باری یاخیبوون و تێکڕژان بووە. لەکاتێکدا شۆڕشی نوێ مەسەلەیەکی زانســتییە، تەنانەت ئەگــەر ئایینیش بێت. لەبەرئەوەی ئایینیبوون لێرەدا پێویستی بــە پرۆسەیەکی عەلمانیکردنی پێش خۆی هەیە، **یەکەم** چونکە پاش ئەوە دێت کە پیرۆزی لە سیستەمی سیاسیی کۆمەڵایەتیی باو دادەماڵرێ و شۆڕش لە دژی شیاودەبێت. **دووەم** لەبەرئەوەی پێویستیدەکات خەڵک چارەنووسی خۆیان لە چوارچێوەی دەوڵەتی نیشتمانیی باودا دیاریبکەن، تەنانەت ئەگەر ئایینیانە ئەوەیان دارشتبێ، بەوپێیەی دەوڵەتی نیشتمانی مەسەلەیەکی نوێ و قەوارەیەکی عەلمانییە. **سێیەم** پرۆسەی بە عەلمانیکردنی لەوەوبەر وایکردوە گوتاری ئایینی بەسیاسی بکرێت، یان هەوڵبدات سەرلەنوێ سیاسەت داگیربکات.

حەنە ئارندت ساڵی ١٩٦٣ کتێبەکەی «**دەربارەی شۆڕش**»ی لە ژێر کاریگەریی شۆڕشە نوێکانی فەرەنســا و ڕووســیادا نووسیووە، بەڵام

بەهێزەوە ئاوڕی لە شـۆڕشی ئەمریکـی داوەتەوە. ئارندت لەم کتێبەیـدا - کاتێک نووسیویەتی و بڵاویکردۆتەوە کـە لـە ویلایەتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ژیانی بەسەربردووە- دەڵێت: «شۆڕشەکان تاقە ڕووداوی سیاسین، کـە ڕاستەوخۆ ڕووبەڕوومان دەبنەوە، بەشێوەیەکی وەها ناتوانین بە مەسەلەی سەرەتایی لێی دەربچین. چونکە هەرچەند هەوڵبدەین پێناسەی شۆڕشەکان بکەین، هێشتا تەنیا چەند گۆڕانکارییەکن و هیچی تر نین» (٢٢). ئەمە بۆ شۆڕشە زانستیو هونەرییەکانیش ڕاستە، لەبەرئەوەی بەکارهێنانی شۆڕش هەمیشە بازدان لەخۆدەگرێت، نەک وردەوردە. جیاوازیی زمانەوانیی- بەئینگلیزی- نێوان گەشەکردنی بەردەوامو وردەوردە (Evolution) و بازدانی چۆنایەتیش کە دابڕان لەگەڵ پێش خۆیدا دروستدەکات (Revolution)، لێرەوە سـەرچاوەیگرتووە. ئەگەرچی مارکس و ئەنگڵز و دوای ئەوان لێنین هەڵوێستی باشـیان بەرامبەر بە تیۆری سەرهەڵدان و گەشەکردن لای داروین هەبووە، بەڵام هەوڵیانداوە دژی ئەو تێڕوانینە ڕاوەستن، کە گەشەکردن وەک پرۆسەیەکی بەردەوام و وردەوردە دەبینێت و هەوڵیانداوە جەغت لەسەر ئەوە بکەنەوە کە کەڵەکەبوونی چەندایەتی لە ڕێی بازدانێکەوە دەبێتە هۆی گۆڕانکاریی چۆنایەتی. ئەم بازدانەش

دیاردەیەكی سروشتییە، یان هاوتەریبێكە لە سروشتدا بۆ شـۆڕش لە كۆمەڵگەدا. ئەوەش یەكێك بوو لەو هەوڵدانە فەلسەفییە كەمانەی ماركس بۆ دۆزینەوەی جۆرێك لە ئەنتۆلۆژیا (بوونناسی Onthology)، كـە بەپێی داروین هاوتەریبی تیـۆرە كۆمەڵایەتیەكانە، بەڵام بەپێی لێكدانەوەیەک كـە سـەپێنراوبوو بەسەر ئەمەی دواییدا.

شۆڕشە نوێكان شتێكی شایستەی باسكردنی هاوبەشیان لەگەڵ ئەوەدا نییە كە لە مێژووی ڕۆمانیی كۆندا پێیدەوترا «ناكۆكیی ئەهلی». هەروەها ناتوانین شۆڕشەكان بشوبهێنین بە پێناسەكەی ئەفلاتون دەربارەی شۆڕش كە دەڵێت: «گۆڕانكارییەكی نیمچە سروشتییە لە شێوەیەكی حكومەتەوە بۆ شێوەیەكی تر. ئەم گۆڕانكارییـەش دووبارە و بازنەیی بووە و بەگشتی شتێكی نوێ ناهێنێتەئاراوە». سـەردەمە كۆنەكان ئاشـنان بە گۆڕانكاریی سـیاسـی و ئـەو توندوتیژییەی هاوشانی بووە، بەڵام ئەو سەردەمانە ئەوەیان بەدی نەكردوە، ئەو گۆڕانكاری و توندوتیژییە بتوانن شتێكی تەواو نوێ بهێننەئاراوە. هەرچۆنێك بێت پێناسەی شـۆڕش بەپێی تێگەیشتنە كۆنەكە، لەگەڵ پێناسە نوێكە لەو ڕۆڵە گەورەیەدا پێكدەگەن كە مەسـەلەی كۆمەڵایەتی لە گشـت شـۆڕشـەكاندا گێڕاویەتی» (٢٣).

شۆڕشە نوێکان ئەو گۆڕانکارییە دووبارەوەبووانە نین، کە بەپێی سووڕی دووبارە لە حوکمڕانیدا ڕوودەدەن، وەک ئەوەی لای بیریارانی فەلسەفەی یۆنانی - وەک ئەفلاتون یان ئەرستۆ - پۆلێندەکرێن. سووڕە خەڵدونییەکەش نییە، کە دەبێتە هۆی لەناوچوونی دەستەگەرییەک و سەرهەڵدانی یەکێکی تر. هەروەها سووڕێکی بەردەوام نییە لە ژیانی دەشتەکییەوە بۆ شارستانییەت. چونکە ئەم وێناکردنانە، سەرباری گرنگییان، توانای هاتنەئارای شتێکی تەواو نوێیان لەخۆنەگرتووە. شۆڕش لە سەردەمەکەماندا، گرێدراوی نوێ و دابڕانە لە ڕێڕەوی گەشەکردنی مێژووییدا، شۆڕش ئەو دابڕانەیە کە نوێ دێنێتەئاراوە.

زۆرێک لە توێژەران ئارەزووی ئەوەیان هەیە بڵێن، ئەوەی شۆڕشەکان لە گۆڕینی ڕووتی حکومەت جیادەکاتەوە، ڕەهەندی کۆمەڵایەتیە و پەیوەندیی بە سەرهەڵدانی سیستەمی ئابووریی نوێوە هەیە. ئەمە ئەوەیە کە شۆڕشە نوێکان بەکردەوە جیادەکاتەوە. ئەم ڕایەش نەریتێکی توێژینەوەی مارکسیانەیەو تەنیا دوو شۆڕش بەم مانایە دەبینێ: شۆڕشی فەڕەنسی (١٤ی تەممووز/ یولیۆی ١٧٨٩) و شۆڕشی ڕوسی (تشرینی یەکەم/ ئۆکتۆبەری ١٩١٧). بەپێچەوانەی ئەوەی باوبووە، ئەم وێناکردنە بۆ گۆڕینی حوکمڕانی

نوێ نییە، چونکە فەیلەسووفەکانی یۆنان، لەپێش هەموویانەوە ئەرستۆ، ئەم ڕەهەندە کۆمەڵایەتیەیان لە بنچینەی گۆڕانکارییەکانی حوکمڕانیدا بەدیکردوە، لەبەرئەوەی بەلای ئەرستۆ و ئەفلاتونەوە ڕوونبووە، کە ڕووخاندنی حکومەت لەلایەن دەوڵەمەندەکانەوە دەبێتە هۆی دامەزراندنی حکومەتێکی ئۆلیگارشی، لەکاتێکدا دیموکراسی بەرهەمی کودەتایەکە هەژارەکان دژی دەوڵەمەندەکان بەرپایدەکەن. تەنانەت ستەمکاران لەکاتی دەسەڵاتگرتنەدەستدا ڕەوایەتی لە هەژارانەوە بەدەستدێنن، کە پشتبەستووە بە خواستی هێنانەدیی یەکسانی لەلایەن هەژارانەوە. هەتاکو ئێستاش ئەو واتایە لەسەردەمە نوێکاندا بەردەوامە، وەک باری ئەو ستەمکاریانەی لەسەر بنچینەی گوتاری ئابووریی پۆپۆلیستانەو ڕەوایەتیی یەکسانی خەڵک لە هەلومەرجەکاندا دادەمەزرێن. جا ئەوە دابینکردنی پێداویستییە بنچینەییەکان بێت یان یەکسانیان لە نەبوونی مافە سیاسییەکاندا. تێڕوانینی ڕەهەندی کۆمەڵایەتی ئابووری لە پرۆسەی گۆڕانکاریی سیستەمە سیاسییەکاندا پێش سەردەمی نوێش لەئارادابووە، بەڵام لێرەدا دەبێت ڕەهەندی کۆمەڵایەتی لە شۆڕشی سیاسیدا لە دانانی شۆڕشی سیاسی بە گۆڕانکاریی سیستەمی ئابووری جیابکرێتەوە.

ئەم بیرۆکەیە لە لێکدانەوەی چەپڕەوانەی شۆڕشی فەرەنسییەوە سەرچاوەدەگرێت، کە شۆڕش بە گۆڕینی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی بە یەکێکی تر دادەنێت. لەڕاستیدا ئەوە شۆڕشی فەرەنسی بوو پەیوەندییە کشتوکاڵییە دەرەبەگایەتییەکانو بەربژێریی دەستە نێوانکارەکان و بەربژێرییە دەرەبەگایەتییەکانی گشت ناوچەکانی ئەوروپای خۆرئاواو ناوەڕاستی هەڵوەشاندەوە، جا لە ڕێگەی کاری ڕاستەوخۆوە بووبێ لە فەرەنسا، یان بەهۆی کاردانەوەوە بووبێ بەرامبەری، یاخود ئەنجامی چاولێکردنی بووبێ، ئینجا ئەو پرۆسەیە لە شۆڕشەکانی ساڵی ١٨٤٨دا گەیشتە لوتکە (٢٤).

ئەمە بەو مانایە نییە کە شۆڕشی سیاسی تەنیا گۆڕینی سیستەمی کۆمەڵایەتی دەگرێتەوەو ئەوە بخرێتەڕوو کە بەبێ ئەم گۆڕانکارییە لە سیستەمی ئابووریی کۆمەڵایەتیدا، ناکرێت وشەی شۆڕش بەکاربهێنرێت، چونکە گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی پرۆسەیەکی مێژووییە چەندین بازدانی «شۆڕشگێڕانە» لەخۆدەگرێت، کە دەبنە هۆی هەڵوەشانەوەی بونیادە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان و دەشێت بەشێوەی چەند شۆڕشێکی سیاسی گوزارشت لەخۆیان بکەن، بەڵام بەپێویست لە ڕێگەی شۆڕشە سیاسییەکانەوە ڕوونادەن، ئەمەش بۆ ئابووری و سیاسەت ڕاستە.

ئەگەر بشمانەوی سووربین لەسەر لایەنی شۆڕشی سـیاسـی لە پرۆسـەی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتیدا، ئەوا دەبێـت لەبیرمان بێـت، دەشێت گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی بە شـۆڕشـێک یان زیاتر لە شۆڕشێکدا تێپەڕێت، یاخود دەکرێـت گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی وردەوردە و بەبێ چەند شۆڕشێکی سیاسی ڕووبدات. ئەگەر مەبەست لە شۆڕش، بازدانی چۆنایەتی بێت لە سیستەمێکی کۆمەڵایەتیەوە بۆ یەکێکی تر، ئەوا شـۆڕش سەبارەت بە «شـۆڕشی زانسـتی»و «شۆڕشی پیشەساز»یش ڕاستە. لێرەدا، بەپێی دەربڕینەکەی تۆماس کون (Thomas Kuhn) لە کتێبەکەیدا «**بونیادی شۆڕشە زانستییەکان**»، مەبەست لە شۆڕش بازدانی بەکواڵیتی یان چۆنایەتییە لە شێوازێکەوە بۆ یەکێکی تر، یان لە سیستەمێکەوە کە پارادیمێکی (نموونەیەکی باڵا Paradigm) دیاریکراو تیایدا باڵادەسـتە، بۆ سـیسـتەمێکی جیاواز، کە پارادیمێکی تر تیایدا زاڵە. لایەنی نوێبوون و گۆڕینی سیستەمەکە و ئەو یاسایانەی کۆنترۆڵیدەکەن لەناو شۆڕشە زانستییەکانیشدا هەیە.

کاتێک دەسـتەواژەی شـۆڕشی پیشـەسازی بەکارهێنراوە، مەبەست لێی- وەک ئەوەی لە سیاسەتدا هەیە- ڕووداوێک نییە سەرەتا و کۆتایی هەبێت، بەڵکو وەک کۆمەڵناسەکان هەتاکو ئیمڕۆ دەڵێن، پرۆسەیەکی

بەردەوام یـان دینامیکیەتێکی کۆمەڵایەتییـە، بەڵام بێگومان بە بازدانێکی دیاریکراو- پاش کەڵەکەبوونێکی درێژخایانی زانینەکان- دەستیپێکردوە. ئەم بازدانەش لە هەردوو سەدەی حەڤدەیەم و هەژدەیەمدا ڕووی داوە، بەڵام بەشێوەیەکی ڕوونتر لە سەدەی هەژدەیەمدا وەک پرۆسەی تێپەڕاندنی بونیادە کۆمەڵایەتیەکان و بەشێک لەو دەرهاویشتە سروشتیانە هەنگاوی هەڵهێناوە کە هێزەکانی بەرهەمهێنانی کۆمەڵگە مرۆڤایەتییەکانیان کۆتوبەنددەکرد.

لەوەوپێش ڕووی نەدابوو مرۆڤ یاسـاکانی سـروشت بەو ئەندازەیە کۆنترۆڵ بکات و بخاتەگەڕ بۆ دەسـتەبەرکردنی پێداویسـتییە مادییـەکانی و بەرهەمهێنانی پێداویستی نوێ، کە لەگەڵ پرۆسەی گەشـەکردنێکی ئاوەدانکردنەوەی بێوێنـە خێرادا دەستیپێکردبوو و گەشەکردنەکەی ئێستای گەیشتۆتە قۆناغی ئابووریی مەعریفە. دەکرێت ڕێژەییانە شۆڕشی پیشەسازی و شـۆڕشی زانسـتی لێک جیابکەینەوە، چونکە فەڕەنسا لە ڕووی شۆڕشی زانستیی تیۆرییەوە پێش بەریتانیا کەوتبوو، لەکاتێکدا بەریتانیا لە ڕووی شۆڕشی پیشەسازییەوە پێش فەڕەنسا کەوتبوو.

تۆماس کون لە کتێبەکەیدا «**بونیادی شۆڕشە زانستییەکان**» هێمادەکات بۆ لێکچوونی مەجازی لـە بەکارهێنانی وشەی شۆڕش لە هەردوو دەستەواژەی

«شۆڕشی زانستی» و «شۆڕشی سیاسی»دا: چی پاساو بۆ بەکارهێنانی هاوتەریبی وتە یان وشەی «شۆڕش» دەهێنێتەوە؟ پێناسەی شۆڕشی زانستی لای کون بریتییە لە گوێزانەوەی وردەوردەی پارادیمێک (Paradigm) بۆ پارادیمێکی ترکە جێگەی دەگرێتەوە. ئەو گۆشەنیگایەکی نوێ سەبارەت بە تیۆرێکی زانستیی لێکدەرەوەخوازانە دەخاتەڕوو، ئەنجامی لێکدانەوە نوێکەی دیاردە نوێکانیش نموونەیەکی نوێ بۆ لێکدانەوەی ئەو دیاردانە سەرهەڵدەدات، کە ئەو زانستە بەگشتی تاوتوێیاندەکات، لەوانە چەند تیۆر و چەند یاسایەکی نوێ. ئەوە گۆشەنیگایەکە لە نموونەیەکی بنەماگەرانەی لێکدانەوەخوازی واقیعەوە هەنگاوهەڵدەنێت، کەواتە لێکچوونەکە لێرەدا لەکوێدایە؟ لێکچوونەکە لە دوو مەسەلەدایە:

١- بەرپابوونی شۆڕشی سیاسی ئەنجامی زاڵبوونی هەستێکی گشتی، یان بڵاوبوونەوەی چەند وێناکردنێکی نوێیە لە کۆمەڵگەی سیاسیدا، دەربارەی ئەوەی چیتر دامەزراوە سیاسییە باوەکان توانای ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو کێشە و مەسەلانەیان نییە کە بونیادی سیاسی دەیانخاتەوە، ئەوانەش چەند مەسەلەیەکن ئەو دامەزراوانە بوونەتە هۆی سەرهەڵدانیان. لە باری شۆڕشی زانستیدا گوێزانەوەکە کاتێک ڕوودەدات، کە پارادیمی باڵادەست ناتوانێت ئەو

دیاردانە لێکبداتەوە کە خۆی بۆتە هۆی دۆزینەوەیان، یان خۆی بۆتە مایەی پێگەیشتنیان. لە هەردوو بارەکەشدا قەیرانێک سەرهەڵدەدات هیچ دەرفەتێک نابینێتەوە جگە لە نکۆڵیکردن لە واقیعی نوێ، یان گۆڕینی ئامرازەکانی لێتێگەیشتنی.

٢ - شۆڕشەکان ئامانجیان گۆڕینی دامەزراوە سیاسییەکانە، بە ڕێگە و شێوازگەلێک کە ئەو دامەزراوانە یاساخیان دەکەن. وەک چۆن شۆڕشی زانستی ئەو پاساوانە ڕەتدەکاتە کە پارادیمی زانستیی کۆن بە زمانی کۆن دەریدەبڕێت، بەمەبەستی داکۆکیکردن لەخۆی یان پاراستنی خۆی، ئاوەهاش شۆڕشی سیاسی ئەو وشە و بیانوانە ڕەتدەکاتەوە کە داکۆکی لە دەستووری باو دەکەن. بێگومان لە هەردوو باریشدا هەر پارادیمێک لە زانستدا، یان هەر دەستوورێک لە سیاسەتدا توانای ئەوەی هەیە بە زمانی خۆی بەرگری لەخۆی بکات، چونکە زمانەکەی لە بنەڕەتدا لەخۆیەوە هەڵقوڵاوە، بۆیە سەیرنییە لێکی بداتەوە، بەو پێیەی بیانوهێنانەوە بۆ سیستەم بە زمانی خۆی، بیانوهێنانەوەیەکی بازنەییە و بێگومان لەتوانایدایە پاساوی بۆ بهێنێتەوەو بەرگریی لێ بکات. لەبەرئەوە شۆڕشی زانستی لە پارادیمی باو دەردەچێت و بە چەندین وشەی نوێی هەڵقوڵاو لە تیۆرە نوێکەوە ململانێیەک لەگەڵ موحافەزەکاران بەرپادەکات.

هەروەها شــۆڕشی ســیاســی وشەکانی سیستەمی سیاسیی باو ڕەتدەکاتــەوە و بیانوو بۆ بــوونی خۆی لە ڕێگەی چەندین وشــەی نوێوە دەدۆزێتەوە، کە هەڵقوڵاوی تێڕوانینێکی نوێیە (٢٥).

لەگەڵ دەســتپێکردنی قەیــرانی ســیاســی، تاکەکــان دەربــارەی سیســتەمی سیاسی هەست بەنامۆبوون دەکەن، کاتێک قەیرانەکە قوڵدەبێتەوە، نامۆبوون دەگۆڕێــت بۆ چەندین ئاقاری ســیاسیی لایەنگــری گۆڕانکــاری، کاتێکیــش مەســەلەکان دەگەنە ڕادەی لێک جیابوونــەوەی بانگەشەکارانی گۆڕانکاری و بانگەشەکارانی پاراستنی بارودۆخی باو، مەرجەعییەتێک لەئارادانامێنێ بۆ لێککردنەوەی ناکۆکییەکان، چونکە ناکۆکی لەســەر ئەوەیــە کــە دەکرێت بیانوی بــۆ بهێنرێتەوەو لەســەر سەرچاوەی ســیاسی و کۆمەڵایەتییە، چونکە دامەزراوگەلی ڕەوای برواپێکراو لەلایەن هەموانەوە لەئارادا نابێت کە بکرێت بۆ لێککردنەوەی ململانێ پەنایان بۆ ببرێت. لێرەدا، بەپێی بارودۆخی مێژوویی، پەنا بۆ میللەت یان هێز دەبرێت.

سوورە کۆنەکە– بەدووبارەبوونەوە ناسراوەکانی فیکری ســیاســیی یۆنانــی لەنێــوان ئۆلیگارشی، ئەریستۆکراسی، دیکتاتۆری، ستەمکاریو دیموکراسیدا – لەسەر بنچینەی جیاوازییەکان دامەزراوە، کە دەبوایە

سروشتی بێت لەنێوان دەوڵەمەند و هەژار، تایبەتی و گشتی، حوکمڕان و حوکمڕانیکراوەکاندا... هتد. ئەو دەرهاویشتە «سروشتی»یانە وایانکردوە- لە ڕوانگەی کەسانی دێرزەمانەوە- دووبارەبوونەوەی شێوازەکانی حوکمڕانیی دیموکراتی و ئەریستۆکراتی و ئۆلیگارشیش مەسەلەیەکی سروشتی بێت، چونکە لەو ڕوانگەیەوە ئەوانە پشتبەستوون بە چەند دەرهاویشتەیەکی سروشتی، لەوانە دابەشبوونی کۆمەڵایەتیی باو، بەپێی سروشتی کۆمەڵگەکان و چەند ئارەزوویەکی مرۆڤانە کە لەناو مرۆڤدان. تەنیا لە مۆدێرنیتەدا دەکرێت باسی ڕاوەستانی ئەو سوورە بکرێت، بەواتای: ڕەتکردنەوەی بینینی جیاوازییە کۆمەڵایەتییەکان، وەک چەند دەرهاویشتەیەکی سروشتی و وێناکردنی کۆمەڵگەیەکی واقعی بەبێ هەژاری، کە بتوانێت یەکسانی نێوان خەڵک، لە ڕووی ئەوەی دەکرێت ناوبنرێت مافەکان، بهێنێتەدی.

حەنە ئارندت ئەم گۆڕانە گرێدەداتەوە بە بوونی واقعیی کۆمەڵگەی ئەمریکیی پێش شۆڕشی ئەمریکییەوە، کە ئەنجامی دەوڵەمەندیی وڵاتەکە بەدەربوو لە هەژاری. دەکرێت شتێکی تریش بخەینە سەر بیانوەکانی ئارندت- پێش ئەوەی ڕەتیان بکەینەوە- ئەویش ئەوەیە کە تەنیا زاڵبوون نەبووە بەسەر هەژاریدا، بەڵکو توانای فراوانبوونی زەویش،

ئەنجامی نیشـــتەجێکردنی زۆرەملێیانە، وایکردوە بڵاوبوونەوە یان کۆچکردن جێی قبوڵکردنی پێگەی چینایەتی باو بگرێتەوە. هەروەها بیرۆکەی ئازادی ڕەهەندێکی نوێی تایبەت بە بڵاوبوونەوە لە مەودادا دەستەبەردەکات.

ئازادی لە بارودۆخی ئەمریکیدا، ئازادییە بەمانای ڕیشەیی وشەکە، وەک ئازادیی جوڵە لە شوێندا، چونکە ئازادی پێچەوانەی ئەو کۆتوبەندانەیە کە جوڵەی جەســتە شــەتەکدەدات و دژی ئەو ئاستەنگانەیە کە ڕێگە لە جوڵەی جەســتە دەگرن. بەپێچەوانەی ئەو دڵنیاییخوازییەی ئارندت قســەی پێ دەکات، توانای وێناکردنی کۆمەڵگەکان، بەدەر لە هــەژاری، لە دێرزەمانەوە بەشــێوەی چاوبڕینە ڕزگاریی مرۆڤ لەئارادابــووە. ئــەوەی بارەکــەی ئەمریکا و ئینجا شۆڕشی فەڕەنسی جیادەکاتەوە، سەرهەڵدانی بەرزیخوازییەکە لای توێژێکی کۆمەڵگە – دەکرێت لە فەڕەنسا ناوبنرێت «چینی سێیەم» و لە ئەمریکا ناوبنرێت کۆمەڵگەی «شارە» ئەمریکییە نیشــتەجێکــراوەکان (town community) – کــە پێیوایە چەندین مافی هەیە و مافی خۆیەتی نەک هەر باشترین ژیان بەسەربەرێت، بەڵکو بەشداربێت لە خۆبەڕێوەبردندا (لەباری شارە ئەمریکییەکاندا) و لە بەڕێوەبردنی کاروباری نەتەوەدا (لەباری فەڕەنسادا).

پێمانوایە ئەمە ئەو شتەیە کە حەنە ئارندت نەیبینیوە. مەسەلەکە تەنیا لە «خۆشگوزەرانیی سەرسوڕهێنەر»ی کیشوەرە نوێکاندا نییە، تەنانەت ئەو کاتەی کۆلۆنیی ئینگلیزیش بوونو توانای وێناکردنی کۆمەڵگەیەکی بەدەر لە هەژاری شیاوکردبوو، بەڵام لەگەڵ ئارندتو ئەوانیتر هاوڕاین، شـۆڕشـەکان بـەم مانایـە بەری مۆدێرنیتەیە، نەک کولتوور یان ئایینێکی دیاریکراو.

تێگەیشتنی نوێ دەربارەی شۆڕش بەڕادەیەک بەهێزبوو، کە شۆڕشگێڕە فەڕەنسییەکان هەوڵیاندا، لە چوارچێوەی پلانە ئەقڵانیەکەیاندا بۆ بەرجەستەکردنی بیرۆکەکە یان هەستکردن بەوەی شۆڕشەکان دەرگا بەڕووی مێژوویەکی نوێدا دەکەنەوە، لەبری ڕۆژژمێری زایینی ڕۆژژمێرێکی نوێ دابنێن، کـە بـە ساڵی لەسێدارەدانی پاشا و ڕاگەیاندنی کۆمار دەستپێدەکات، هەروەها نـاوی هەرێمـە کۆنەکـان هەڵوەشێننەوەو بە ژمـارە ناویـان بنێن، وەک ئەوەی شۆڕشەکە ڕووداوێکی گەردوونی بێت و دوای ئەو ناوی نوێی مانگەکان و ژمارەی نوێ بۆ ساڵەکان دەستپێبکات. ئەو هەوڵدانە لەو کاتەدا هەرزەکارانە نەبوو، تەنانەت لە ڕوانگەی سـەردەمی نوێوە، کە گرنگیی مەسەلە سمبولییەکان کەمدەبێتەوە، وەک: ناونانی مانگەکان، ئەوەی شۆڕشی فەڕەنسی ئەنجامیدا و بریتی بوو لە دامەزراندنی دەوڵەتی نیشتمانیی نوێو ئاڵاو دامەزراوەو

سـمبولەکانی، وەک هەوڵدانێـک بۆ ڕێکخسـتنی کۆمەڵگە بەپێی پلانێکی ئەقڵانیی وەها، کە هەموو شتێک لە جێگەی دەسەڵاتە هەرەمەکییەکانی پێشوو یەکبخات. بەلشـەفیکەکانی شـۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧یش کۆششیانکرد بۆ سەرەتایەکی نوێ و لای ئەوان – بەتایبەتی لای لێنین – لەسەر بنچینەی پلانێکی ئەقڵانیی مێژوویی چاولێکردنی زۆری شۆڕشی فەرەنسی هەبوو بۆ بنیاتنانی ڕووسیای نوێ و بە جیدی خەویان بە توانای بنیاتنانی مرۆڤی سۆڤێتیی نوێوە دەبینی. ئەو نوێبوونە تراژیدییە، بە وتەی کارل پۆپەر (Karl Popper)، بووە هۆی چەند هەوڵدانێکی ئەندازەسـازیی کۆمەڵایەتیی گشـتی لە دەوڵەتێکی سەرتاپاگیردا و بەرتەسککردنەوەی ئەقڵانیەت هەتا ئاستێکی ئامرازخوازانە لە جێبەجێکردنە کۆمەڵایەتیو سـیاسـییەکانیدا. جیاوازییەکانیش لێرەدا لەنێوان نازیزم و سـتالینیزمدا، جیاوازییـە لە پلەدا نەک لە جۆر یان بونیاددا، لەبەرئەوەی ئـەو دوو نموونەیە لە نموونەیەکی مێژوویی ئامانجخوازی گەشـەکردنی کۆمەڵایەتی– ئابوورییەوە سەرچاوەدەگرن، بەوپێیەی گەشەکردنی مێژووە ڕوەو هێنانەدیی ئامانجی باڵای پایەبەرزی خواوەندانە، کە دەستەبژێر، یان چین، یان نەتەوە، یاخود ڕەگەزێکی دیاریکراو بەرزیانکردۆتەوە، لەگەڵ بوونی جیاوازییەکدا، ئەویش ئەوەیە یەکێکیان

بە ئایدیۆلۆژیایەک بیانوو بۆ سیستەمە سەرتاپاگیرە سەرکوتکەرەکەی دەهێنێتەوە، کە بەهاگەلی گەردوونی وەک ئازادی و یەکسانی لەخۆدەگرێت، لەکاتێکدا ئایدیۆلۆژیای نازیزم لەسەر بنچینەی ڕەتکردنەوەی ئەو جۆرە بەهایانە دامەزرابوو.

# ئازادی و شۆڕش

بیرۆکەی دیموکراسی لەسەرەتاوە گرێدراوی بیرۆکەی یەکسانی بووە. مەبەست لە یەکسانیش تەنیا یەکسانیی نێوان حوکمڕانەکان نییە، بەڵکو یەکسانیی نێوان حوکمڕان و حوکمکراوەکانیشە. لێرەوە دیموکراسی، لە گۆشەنیگای دەستەبژێری شاری یۆنانییەوە (Polis)، بە جۆرێک لە ناحوکمڕانیبوون یان حوکمڕانیی زۆربەی خەڵک دانراوە. حوکمڕانیی زۆربەی خەڵکیش لە ڕوانگەی لایەنگرانی سیستەمی ئەریستۆکراتی یان دەستەبژێرانەی ڕابردووەوە- وەک ئەفلاتون- خراپترین جۆرەکانی حوکمڕانییە، چونکە بە تەواوەتی هاوجووتە لەگەڵ ئازادیی نێگەتیڤانەو ئارەزوونەکردنی ئەوەی حوکمڕانی بکرێیت، واتە باری «ناحوکمڕانی»یە دەبێتە مایەی «ئاژاوەی زۆربەی خەڵک».

زۆرێک لەو موحافەزەکارانەی دژی «ئاژاوە»ی شۆڕشی فەرەنسی بوون، لە سالانی سەرەتای شۆڕشدا ئەم ئاراستەیەی دژی دیموکراسی و شۆڕشە

توندوتیژەکانیان بەمیرات بۆ مابۆوە و دیموکراسیو ئەو یەکسانیەیان تێکەڵدەکرد کە مەیلی ئەوەی هەبوو خۆی بکاتە بارێکی سروشتی، وەک ئەوەی ناو ڕەوتە یەکسانیخوازە توندڕەوەکان. چونکە بەبڕوای ئەوان، ئەوە دەگۆڕێت بۆ دژەکەی ئازادی، کە لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە لە دەرەوەی جیاوازی بوونی نابێت. هەمیشە موحافەزەکاران ئەوە لەیاددەکەن، بنەڕەت لە دیموکراسیی نوێدا، یەکسانییەکە بە یاسا لەنێوان ئەوانەدا هێنراوەتە ئاراوە کە لە ڕووی سرووشتییەوە نایەکسانن. یەکسانیی ڕێکخراو لەناو دەوڵەتدا، یەکسانییەکە یاسا بۆ بارێکی سروشتیی نایەکسانیی نێوان مرۆڤەکان ڕێکیدەخات. ئەو یەکسانییە وادەکات تاکە نایەکسانەکان وەک هاوڵاتی یەکسان بن، ئەمەش لە دەوڵەتدا شیاوە. ڕێکخستنی ئازادیش مەسەلەیەکە تایبەت بە دەوڵەت و ئازادیی هاوڵاتییە. لێرەدا ئازادی دژەکەی یەکسانی نییە، وەک موحافەزەکارەکانی وەک تۆکفیل و ئەدمۆند بیرک بۆی دەچن، یەکسانی وێرانکەری ئازادیش نییە، بەڵکو یەکسانی لە هاوڵاتیبووندا مەرجی ئازادییە. بۆیە خەباتکردن لەپێناو قوڵکردنەوەیدا، یەکسان دەبێت بە پرۆسەی بەهێزکردنی مافەکانی هاوڵاتیبوون یان زۆرکردنیان، هەتاکو چەندین کایەی فراوان بگرێتەوە، لەکاتێکدا ئازادی لە ڕەوتی

کارلێککردنێکی بەردەوامی نێوان ئازادییە تایبەتی و گشتییەکاندا ڕێکدەخرێت.

زاراوەی ئازادی هەتاکو شۆڕشی فەڕەنسی وەک دژی کۆیلایەتی و بەندایەتی بوو، کتومت وەک چۆن دەستەواژەی ئازاد لە ژیواری ئیسلامیدا وەک دژەکەی بەنـــدە بەکاردەهێنرا. تەنیا دوای شۆڕشی فەڕەنسی ئازادی ئەو مانا سیاسییەی بەدەستهێنا، کە دوو ڕەهەند لەخۆدەگرێت: ڕەهەندی ڕەتکەرەوەی ئـــەو کۆتوبەندانەی ئازادییـــەکانیان بەنددەکـــرد، بەو جۆرەش ئازادی بەمانـــا نێگەتیڤەکەی دەبێتە کۆمەڵێک ئـــازادی (Liberties)، ئینجـــا ڕەهەندی ئەوەی ئازادی بریتییە لـــە بەشداریکردنی هاوڵاتی لە دیاریکردنـــی چارەنووسی خۆیدا و لە ڕێگـــەی بەشـــداریکردنەوە لە بەڕێوەبردنـــی کاروبارەکانی نیشتماندا (free citizen, freedom).

شۆڕشە نوێکان کۆششدەکەن بۆ ڕزگاربوون لەدەست سەرکوتکردنی ئازادی، کە لەم بارەدا بە لە جوڵەخستنی لەشەکان دەچێت. ئەوەش ڕزگاربوونە لەو کۆتوبەندانەی ئازادییەکانی مرۆڤ بەنددەکەن، ئینجا ڕزگاربـــوون لە تـــرس و ئەو پێداویستییە بنچینەییانەی دەستەبەرنەکردنیان دەبێتـــە مایـــەی بەکۆیلەکردنی ڕۆح و جەســـتە. ئـــەم ڕزگاربوونە خەونی ئـــازادی دێنێتە ئاراوە، بەڵام ئازادیی سیاسی

و کۆمەڵایەتی کە لە ڕێگەی بەشداریکردنەوە پیادەدەکرێت بۆ دیاریکردنی چارەنووس و بڕیارسازی، دوەمین ڕەهەندە ئازادی لە ئازادیی نێگەتیڤانەوە دەگۆڕێت بۆ ئازادییەکی پۆزەتیڤانەی پیادەکراو. لێرەوە هەر سیستەمێکی دیموکراتی پێکدێت لە: **یەکەم** ئەو ئازادییە شارستانیانەی بیرۆکەی «ڕزگاربوون لە» مسۆگەردەکەن، **دوەم** «ئازادی لەناو»، ئەمەش مانای ئەو مافە سیاسیانەی هاوڵاتیبوونەو «ئازادی لەناو» دەوڵەتدا بەهۆی ئەو دامەزراوانەوە بنیاتدەنێن کە پیادەکردنی مسۆگەردەکەن. مافی ئەو دامەزراوانە نییە ڕێگە لە ئازادییە بنچینەییەکان بگرن، نەک هەر ئەمە، بەڵکو ڕێکخستنی ئەو ئازادییانە مەرجی بوونی ئەوانە. ئازادییە سیاسییەکان، ئەو ئازادییە دامەزراوەییانەیە کە بەشداریکردنی هاوڵاتی لەناو دەوڵەتدا مسۆگەردەکەن.

دەکرێت باسی ئەو شۆڕشانە بکرێت کە لە کاری یەکەمدا – واتە بنیاتنانی دیموکراسی – شکستدەخۆن، بەڵام ناکرێت لە سەردەمی نوێدا باسی شۆڕشانێک بکرێت تامەزرۆی هێنانەدیی کاری یەکەم – واتە ڕزگاربوون – نەبن. «تامەزرۆبوونی ڕزگاری و بنیاتنانی ماڵێکی نوێ، کە بشێت ئازادی تیایدا نیشتەجێ بێت، ڕۆحێکە لەسەرتای مێژووی

ڕابردوودا نموونەی نییە» (٢٦). ئەم ڕۆحە یەکێکە لە خەسڵەتەکانی شۆڕشە نوێکانیش.

شۆڕش بەرپاکردن لەپێناو ئازادیدا هەمیشە بنیاتنانی دیموکراسی مسۆگەرناکات، چونکە بنیاتنانی دیموکراسی پرۆسەیەکی ئاڵۆزی پێکهاتووە لە ڕاگرتنی هاوسەنگیی نێوان گشـتی و تایبـەتی، چاودێریکردنی دەسـەڵاتەکان، ڕێکخسـتنی پرۆسـەی بەشداریکردنی هاوڵاتیان لە دەنگدان و پێش و پاش دەنگدانـدا، مسۆگەرکردنی ئـەوەی زۆرینـە نەبێتە زۆرینەی شوناسێکی نەگۆڕ، بەڵکو زۆرینەی ڕا و بەرژەوەندییەکان بێت، کەمایەتیەکانیش لەسەر ئاستی شوناس نەبنە چەند کەمایەتیەکی سیاسی هەتاهەتایی، مسۆگەرکردنی چەند چارەسەرێکی میانڕەوانە ... هتد. ئێمە ئاشناین بەو ئازادییانەی ئەنجامی پاراستن لە دەستی ستەمکاری دێنەئاراوە، مەبەست ئەو پاراستنەیە کە فرە دەسەڵاتی و لێک جیاکردنەوە و هاوتەریبیی دەسەڵاتەکان مسۆگەریدەکەن، هەتاکو دەسەڵاتێکی دیاریکراو زاڵ نەبێت بەسـەر دەسـەڵاتێکی تـردا. دەشێت فرەگرووپی دانپیانراو، وەک چەند قەوارەیەکی سـیاسـی، ئەو ڕۆڵە بگێڕێت. وەک تایەفە و دەستە ڕایەڵەکارەکان لە فەڕەنسای پێش شۆڕش و ئەوانیتر. جیهانی عەرەبی- بۆ نموونە- کەیسی لوبنانی تێدایە، کە تیایدا زۆر ئازادیی وەک ئازادیی گوزارشتکردن و

ئەوانیتر ڕێکدەخرێت، بەڵام ئەو ئازادیانە لە سنووری تایەفەکاندا کۆتاییدێن و دەوڵەت لەکاتی ناڕازیبوونی تایەفەیەکدا ناتوانێت بیانپارێزێت، چونکە ئازادیی شارستانیی تاک لەم پەراوێزەدایە و هەر ئەویش ڕێگە بە پەرەپێدانی کەسایەتیی دەدات، بەڵام دیموکراسی سەرباری دەستەبەربوونی بڕێک ئازادی لەئارادانییە. لێرەدا نموونەمان دەربارەی چەند ئازادییەکی سیاسیو شارستانیی دیاریکراو لەبەردەستدایە، بەڵام بەبێ دیموکراسی، بە دەربڕینێکی تر ئازادیی زیاتر و دیموکراسیی کەمترمان هەیە.

وڵاتانی وەها هەن دیموکراسی تیایاندا بەبێ شۆڕش هاتۆتەدی، بۆ نموونە وەک باری کەنەدا. باسەکە لێرەدا دەربارەی کۆمەڵگەیەکی نیشتەجێکارە، کە بەهۆی چەندین چارەسەری میانڕەوانە و سازشکردنەوە خۆی لەگەڵ بەریتانیا ڕێکخستووە، ئینجا بەبێ شۆڕشکردن لێی جیابۆتەوە. جیاوازیش لەنێوان ئەو و ئەو دیموکراسییەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە سەربەخۆیی بەدەستهێناوە و لە ڕێگەی شۆڕشەوە دیموکراسیی خۆی بنیاتناوە ئەوەیە، کەنەدا هێشتا زیاتر پەیوەندیی بە کولتووری بەریتانیەوە هەیە و دەیپارێزێت و بەها پارێزراوەکانیش دواتر بەشداریانکردوە لە: دیاریکردنی کێبڕکێی سەرمایەدارانە، دامەزراندنی

**دەوڵەتی خۆشگوزەرانی، سنووردانداان بۆ لیبرالیزم، نەک وەک سۆشیال دیموکراسی، بەڵکو وەک سۆشیالیزمێکی ئەهلی (٢٧).**

**لە ڕابردوودا وشەی شۆڕش بۆ خۆی مانای نوێی لەخۆنەدەگرت. وەک دەستەواژە، وشەکە (Revolution) لە زاراوەیەکی ئەستێرەناسییەوە هاتووە، کە پەیوەندیی بە سوڕانەوەی ئەستێرەکانەوە هەیە بەدەوری تەورەیەکی دیاریکراودا (Revolving). ئەویش بەو مانایە پێچەوانەی وشەی شۆڕشە بەو شێوەیەی لە سەردەمی ئێستادا بەکاریدەهێنین، چونکە مانای جوڵانی سروشتیی بەردەوامی خاوەن خەسڵەتی سوڕانەوەی هەسارەکانە بەدەوری خۆردا. کاتێک ساڵی ١٦٨٨ وشەکە بۆ وەسفکردنی دەرپەڕاندنی خێزانی «ئال ستیوارت» لە حوکمڕانیو گوێزانەوەی دەسەڵات بۆ ولیام و ماری بەکارهێنرا (The Glorious Revolution)، بەکارهێنانەکە بۆ وەسفکردنی گەڕانەوەی دەسەڵات بوو بۆ خێزانێک کە حوکمڕان بوو. بەم مانایەش، وشەی «شۆڕش» بەو بەکارهێنانەی، هێماکردنە بۆ گۆڕانکاریی کودەتاکارانە، کە گەڕانەوەی دەسەڵاتە بۆ خێزانەکە. هەروەها دەستەواژەی شۆڕش بەکارنەهێنرا بۆ وەسفکردنی بزووتنەوەکەی کرۆمویل (١٥٩٩-١٦٥٨) لە ساڵی ١٦٤٩دا، کە بووە هۆی لەسێدارەدانی شا**

شارلی یەکەم... بەم مانایە، دەستەواژەی «شۆڕش» مانای گەڕانەوەی دەسەڵاتە بۆ خاوەنەکانی پێشووی، یان گێڕانـەوەی دەسـەڵاتە لەلایـەن خاوەنەکانی پێشوویەوە. ئەگەر بشـمانەوێ، ئەوا بە لێکدانەوەیەکی فەلسەفیانەی شیاو بریتیە لە گێڕانەوەی دەسەڵات بۆ خاوەنە «سروشتییەکان»ی خۆی. بەوجۆرە دەکرێت پرۆسەی ڕامالێنی دەسەڵات بەهۆی میللەتەوە، چەمکی «گەڕانەوە»ی دەسەڵات بۆ خاوەنەکانی لەخۆبگرێت. بەپێچەوانەی (ئارندت)یشەوە، بەکردەوە بڕوامان وایە ئەوە مەجازێکی ئەدەبییە، زیاتر لەوەی لێکدانەوەیەکی زانستی بێت. چونکە ساڵی ١٦٨٨ وشەی شۆڕشی ئینگلیزی واتای ڕەچەڵەکە واژەییەکانی وشەکەی -وەک جوڵانەوەیەک کە دووبارە دەگەڕێتەوە بۆ هەمان خاڵ- لەدەستدابوو.

ئەوەی دەکرێت لێـرەدا بوتـرێ، نوێبوون مەسەلەیەکە شـۆڕشـگێڕەکان لـە کاتی کارکردن و بەرهەمهێنانداو بەبێ پلاندانان دۆزیویانەتەوە. بێگومان بەشێک لەوانە لە خواستە شۆڕشگێڕییەکانیاندا مەیلی گەڕانەوە بۆ ڕابردووی ڕۆمانی یان یۆنانیی وێناکراویان هەبووە، هەتاکو ڕەگی شوناسی خۆیان یان ڕەچەڵەکی یەکەمی خۆیانی تیـادا داکوتێت. لـە هەندێک باری تردا، مەیلی گەڕانـەوە بـۆ یەکسانیی مەسیحیانەی کۆنی گریمانەکراو هەبووە، ئەوەی خوا لـە سروشتی

ئەو مرۆڤانەدا خولڵقاندویەتی کە لە ڕێی ئەو لایانداوە. بەڵام ڕامالێینی حوکمڕانی و گەشەکردنی بزووتنەوەی نارەزاییدەربڕین بۆ شۆڕش بووە هۆی گۆڕینی پاشا - بۆ نموونە وەک بارەکەی فەرەنسا - بەبێ ئەوەی لەسەرەتادا مەبەست ئەوە بووبێ. هەروەها دامەزراندنی دەوڵەت لە باری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، بەبێ ئەوەی لەسەرەتادا مەبەست ئەوە بووبێ و بەبێ ئەوەی خەڵک ناچاربووبن بیر لە نوێ بکەنەوە. بەو جۆرە، وشەی شۆڕش گرێدرایەوە بە نوێوە. پێدەچێت تێگەیشتنی یەکەم، ئەوەی لای شۆڕشەکان باڵادەست بوو، ئەوە بوو کە بارێکی سروشتی یان چەند مافێکی سروشتیی پێبەخشراو هەیە حوکمڕانیی لێی زەوتکردوون و شۆڕش ئامانجی «گێڕانەوەیانە». هەندێک تیۆریست، کە شۆڕشگێڕەکان پێش شۆڕشی فەرەنسی ئیلهامیان لــە بیروڕاکانیان وەردەگرت، بەدەیان ساڵ تیۆریزەیان کردبوو بۆ مافی سروشتی و باری سروشتی وەک باری سازان، لەوانە بێگومان ڕوسۆ.

بەڵام ئــەو بیرۆکــە فەلسەفییــەی وێنای بارێکی سروشتی یان بارێکی لەو جۆرە دەکــات کە لە ڕابردوودا لەئارادابووە، بۆخۆی بیرۆکەیەکی نوێیــە، جا پێڕەوکارانی پێی بزانن یان نا. ڕوونە کە بیرۆکــەی یەکسانی نێوان خەڵک لە مافەکاندا لە گشت سەردەمەکانی پێشوودا سەیر دەرکەوتووە،

یەکسـانیی سـروشـتیی نێـوان مرۆڤەکانیش لە مەسیحییەتدا لە باشترین باردا یەکسانیی بەندەکانی خوا بووە لەبەردەمی خوادا، تەنانەت ئەو یەکسانییە کاتی ڕێکخستنی لەلایـەن دامـەزراوە ئایینیەکانەوە تووشی شـێواندن بووە. سـەبارەت بە یەکسانی لە مافە سیاسییەکانیشدا، وا دەردەکەوت کە ناکۆکە لەگەڵ چەمکەکاندا، چونکە سیاسەت لەسەر بنەمای گریمانەی نایەکسانیی لـە مافـە سـیاسـییەکاندا دادەمەزرێت.

کەواتە چـی دەربـارەی واتای دەستەواژەی «شۆڕش»ی کۆن و پەیوەندیدار لەگەڵ جوڵانەوەی بازنەیی دەمێنێتەوە، کە هەمیشە دەگەڕێتەوە بۆ هەمان خاڵ؟ پاش کۆششێکی زۆر، دەکرێت بوترێ، ئەوەی ماوەتەوە شتێکە لە چەمکـی ڕاپەڕین، یاخیبوون، ملنەدان، یان ئەو دەسـتەواژانەی جیادەکاتەوە، کە مانای دەرچوونەکـەی سـەرەوە دەدات، بەوپێیەی مەسەلەیەکی حەتمی یان پێویستە. ئەمەش جارێکی تر مەجازێکی ئەدەبییە: ئەگەر شۆڕش دەستیپێکرد، ئەوا دەبێت بگاتە ئامانجەکەی خۆی. لێرەوە خۆمان لەوە بەدووردەگرین شـۆڕشـی ناکامڵ بە شـۆڕش دابنێین، بەڵکو ناوی دەنێین یاخیبوون، یان ڕاپەڕین. بەدەگمەنیش شـۆڕشـی شکستخوارد و ناودەنێین شـۆڕش. شـۆڕش، لـە ڕوانگەی بەکارهێنەرییەوە

لە سـەردەمەکەنماندا، هێمایەکـی حەتمی بوون یان کۆتایی حەتمی لەخۆدەگرێت. زۆرجاریش ملنەدان یان یاخیبوون ناودەنرێت شـۆڕش، پاش ئـەوەی نیشانەکانی هاتنەدیی ئامانج دەردەکەوێت، بەڵام ئەمە هیچ جۆرە لێوەرگرتنێکی زانستی نییە.

ترسی حوکمڕانانیش لە وشەی «شـۆڕش» لێرەوە سەرچاوەدەگرێت، وەک ئەوەی نوشتە یان نەفرەتلێکردن لەئارادابێت، چونکە ئەگەر بەکارهێنرا، ئەوا جوڵانەوەیەک دەگەیەنێت کـە پێش گەیشتن بە ئامانجەکە و تەواوکردنی بازنەکـە گەڕانەوەی نییە. ئەوەی بەکارهێنانی وشەی «شـۆڕش» لـە بەکارهێنانی وشـەکانی تر جیادەکاتـەوە ئەوەیە، بەکارهێنەرەکە دەرک بەوە دەکات شۆڕش واقعێکی بابەتی دێنێتەئاراوە، واتە: گەڕانەوە لێی مەحاڵە. ئەمەش بەپێویست نابێتە هۆی بەکارهێنانی وریایی، چونکە دەکرێت لە سـەردەمەکەماندا گوزارشتکردن بێت لە هیوای گۆڕانی ملنەدان یـان یاخیبوونێک بۆ شۆڕش، بەو مانا نوێیەی لە سەردەمەکانی ڕابردوودا لەئارادانەبووە و جیاوازیدەکات لەنێـوان شـۆڕش و ملنەدان و یاخیبووندا.

شۆڕش، بە مانایەکی دیاریکراو، بزووتنەوەیەکە بەرهەڵستیی ناکرێت. بەڕای ئێمە، ئەم مانا نمایشکارییە ئەدەبییە، ئاسـانکاریی بـۆ فەلسـەفەی سـەدەی

نۆزدەهەم کرد بیخاتە ناو چوارچێوەی پێداویستییە مێژووییەکان و یاساکانەوە. ئەم کارەش کارێکی ئایدیۆلۆژییانەی پێشکەوتووە و هیچ پەیوەندییەکی بە میتۆدی زانستییەوە نییە. لە ئەورووپا نموونەکە شۆڕشی فەڕەنسی بوو، چونکە لەسەر ڕێڕەوی قۆناغ و زاراوەکانی ئەو شۆڕشگێڕەکانی دواتر لە گشت شۆڕشەکاندا ڕۆیشتن و بیریانکردەوە.

دیاردەی سەرنجڕاکێشی شۆڕشی فەڕەنسی، سەرهەڵدانی جەماوەر/ حەشامات بوو. مەبەست لەو هەژارانەیە، کە لە دەرەوەی فەزای گشتی بوون و گۆشەگیرانە لە ماڵەکانی نەبوونیدا ژیانیان بەسەردەبردوەو لە کونجەکانی ڕیسوابوون و پەراوێزخستنندا گرتببوونەوەو بزووتنەوەگەلێک پشتئەستوور بەوان هاتنەئاراوە، کە هەڵوێستی دژی ئەریستۆکراسیان هەبوو.. تەنانەت ئاقارێکی تەواوی جەماوەری ناونران (Les Sans Culottes). زۆرکەس لە سەردەمەکەماندا ئەو ناولێنانە لەبیردەکەن کە مانای بێنەوایان دەگەیەنێت. ئەمانە دیلی دەستی پێداویستییەکانی لەشی خۆیان بوون، کە بەردەوام گوشاریان دەخستە سەریانو نەیان دەتوانی تێریان بکەن. ئەمانە ئەوانە بوون کە کتوپڕ هاتنەدەرەوە بۆ ناو فەزای گشتیو شۆڕشی فەڕەنسییان کردە شۆڕش و کۆتایی شۆڕشەکەیان حەتمی کرد. ئەمانە ئەوانە بوون کە بەختەوەریی میللەتیان کردە دروشمی

شـۆڕشـەکە و لە بنەڕەتدا چەمکی شۆڕشیان بەمانا نوێکەی بەرهەمهێنا. ئەوە مەسـەلەی تازەی شۆڕشی فەڕەنسی بوو، کە دواتر چەمکی هاوڵاتیبوون لەسەر بنچینەی بنیاتنرا، بەڵام مەسەلەیەکی مەترسیداریش بوو بۆ دەسـتورخوازەکان و مافپەروەران، ئەوانـەی پێیانوابوو دەکرێت بزووتنەوەیەکی زۆرینەی میللەت ببێتە بنچینەیەک بۆ خراپترین جۆرەکانی حوکمڕانی، ئەگەر گۆڕا بۆ هەراوهوریایەک بەسەرکردایەتی کۆمەڵێک سـیاسـەتمەداری دیماگۆگی، کـە بەنـاوی میللەتەوە قسەدەکەن. سەدەی بیستەم چەندین نموونەی واقعی دەربارەی ئەم ترسانە خستەڕوو.

مارکس شـۆڕشی هەژارەکانی بە شۆڕشێکی سـیاسـی لەپێناو ئازادیدا دانـا. ئەم گرێدانەوەیەی نان‌و ئازادی ئەو شـتەیە، کە خوێندنەوەکەی مارکس سەبارەت بە شۆڕشی فەڕەنسی جیادەکاتەوە. هەروەها دیموکراتخواز بوو، وەک جـۆری دیموکراتخوازی شۆڕشگێڕی فەڕەنسی لویس ئۆگست بلانکی. ئەمەش وای لێ کرد لەو بڕوایەدا بێت، شۆڕشی فەڕەنسی بەهێنانەدیی ئازادی ئامانجەکانی خۆی نەهێناوەتەدی، چونکە کێشـەی هـەژاری چارەسەرنەکردوە. ئـەو پێیوابوو ئازادی لەگـەڵ هەژاریدا ناکۆکە. لێنین پاش شۆڕشی ڕوسی تەنیا ئەم ڕەهەندەی تێڕوانینی مارکسیزم دەربارەی ئازادیی

پاراست و لەو بڕوایەدابوو، ئازادی مانای ئازادبوونە لە هەژاری و زاڵبوون بەسەر هەژاریی گرێدایەوە بە گەشەکردنی تەکنیکییەوە (کارەبا لەباری ڕووسیادا)، بۆیە زۆر بایەخی بەو دامەزراوانە نەدا، کە پیادەکردنی ئازادی لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە ڕێکدەخەن و ڕوویکردە پەرەپێدانی سەپێنراو بەهۆی دامودەزگای دەوڵەتی ناوەندییەوە، کە بەتەواوەتی ئازادیی خستە ژێر پێوەو تێکڕاگەلی پەرەسەندنی خێرای هێنایەدی، بەڵام لەسەر ئاستی دوورمەودا بووە مایەی شکستخواردنی پڕۆسەی ڕزگاربوون لە هەژاری.

قسەکانی ئەو تاڕادەیەکی زۆر گونجاوبوو لەگەڵ ڕەوتی گەشەکردنی شۆڕشی فەڕەنسیو جەماوەرەکەی. چونکە کاتێک دەرکەوت ئەنجومەنی دامەزرێنەران کێشەی هەژاری چارەسەرناکات، جەماوەری فەڕەنسی دژی ئەنجومەنی دامەزرێنەران ڕاوەستان و کەوتنە سوکایەتیکردن بەو دەستوورەی چارەسەری هەژاری و نەداری نەدەکرد، کتومت وەک چۆن لە ڕابردوودا دژی لویسی شانزەیەم ڕاوەستان، سەرباری ئەوەی نەفرەتیانکرد لە گفتوگۆی سیاسییەکان و پیلانگێڕی و ڕیاکاریی لەناو گوتارەکانیاندا. بەوجۆرە هەژارەکان هەڵگەڕانەوەو جارێکی تر بوونە کەسانی توڕە (هەژاو)، بەڵام ئەمجارە دژی پەرلەمان و دەستوورە یەک لە

دوای یەکەکان، لەکاتێکدا ئەو دەستورە بوو کە زۆرینەی میللەت لە پاریس سوێندیان خوارد هەتاکو نەنووسرێ‌و دەسەڵاتی پاشایەتی ڕازی نەبێت لەسەری «گۆڕەپانی تێنس»ی بەناوبانگ جێ نەهێڵن.

دەشێت هەژاری و نەداری مانای ئازادی لەبیر میللەت ببەنەوە. هەر توێژەرێکی جیدیش چەندین دیمەنی مێژوویی دێتەوە یاد، تیایاندا ئەوە بەرجەستە دەبێت کە جەماوەری هەژارکراو بە ئاسانی دژی مافە شارستانییەکان هاندەدرێن، بەبیانوی ئەوەی ئازادی گەمەی دەوڵەمەندەکانە. هەروەها بەئاسانی هەژارەکان لەپێناو شوناسێکی «ڕەچەڵەکخوازانە»دا، ئایینی یان ناسیونالیستانەدا، کۆدەکرێنەوە بۆ بەگژاچوونی «ساختەیی» ڕواڵەتەکانی ئازادیی بەتاڵ لە هەر ناوەڕۆکێکی سوودبەخش بۆ هەژاران. لە ئەزموونی شۆڕشەکانی عەرەبدا، کە کودەتا جێی شۆڕشی گرتبۆوە، ئەزموونی عەبدولناسر لە ڕێگەگرتن لەو داخوازییە دیموکراتیانەی ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش بڕیاری لەسەردابوون- لە کاتی لێک جیابوونەوەکەی ساڵی ١٩٥٣- وەبیردێتەوە، کاتێک هانی کرێکارانی دا دژی ئەوانەی دەیانویست حیزبەکان بهێننەوە مەیدان. لێرەدا دیوەکەی تری ئیشکالیەتەکە دەوروژێنرێت، ئەویش ئەوەیە کە هەژارەکان دیموکراسییەک

ڕەتدەکەنــەوە لەســەر بنچینەی پەردەپۆشکردنی قۆرخکردنی ســامان لەلایەن دەوڵەمەندەکانەوە دامەزرابێت و ببێتە مایــەی فراوانبوونی کەلێنی نێوان هەژاران و دەوڵەمەندان و هۆی ئەوەی توێژە فراوانەکانی میللــەت نەتوانن ژیانێکی شکۆمەندانە مســۆگەربکەن. بەهەرحــاڵ، ئەمــە ئیشکالییەتی پەیوەندیی نێوان دیموکراسی و پەرەپێدان، مافــە سیاسییە شارستانییەکان و مافە کۆمەڵایەتییەکان، لەسەر ئاستی تاکەکان و ئاستی پەیوەندیی نێوان میللەتەکان، دەوروژێنێت.. بەڵام هەژموونی گوتاری پۆپۆلیستانە بەگشتی لــە هەلومەرجی ناتەواویی دیموکراســیدا، نەک لــە هەلومەرجی دیموکراسیی بەدامەزراوکراودا، سەرهەڵدەدات.

«وشەی میللەت کلیلەوشەیە بۆ تێگەیشتن لە شــۆڕشی فەڕەنســی، ناوەڕۆکی شــۆڕشەکەش ئەوانە دیاریانکرد کە تراژیدیاکانی میللەتیان بەچاوی خۆیان بینــی، بــەڵام بەشــدارییان نەکردن» (٢٨)، چونکە ئەوانــە بیرۆکەی میللەتیــان خەملاند کە خۆیان کردبووە سایەداری میللــەت و دوو شــتیان تێکەڵ بەیەک کردبوو: بەزییهاتنەوە بە میللەتدا وەک کۆمەڵێک بێنەوا و ڕۆمانسییەتی تایبەت بە دڵسافیو دادپەروەریی میللەت. ئەمەش ئەو هەڵویســتەیە، کە قۆناغی «یەعقــوبی» لــە شۆڕشی فەڕەنسیدا

جیادەکاتەوە. دەبوایە ئەم «دڵسافییە میللیە»ش، کە ڕۆمانسیبوونی پۆپۆلیستانە دەیسەپێنێ، جێگەی بایەخدانی جیدی بەشێوازەکانی حکومەتو دامەزراوەکانی بگرێتەوە، واتە ڕێکخستنی پیادەکردنی ئازادیی سیاسی و دەسەڵات. ئەم ڕێکخستنەش ئەو خەمەیە، کە جیرۆندییە میانڕەوەکان جیادەکاتەوە، بەراورد بەو یەعقوبییە شۆڕشگێڕانەی لە شۆڕشی فەڕەنسی وەدەریانان.

وێناکردنی میللەت بەمجۆرە، بووە بنچینەیەک بۆ گۆڕینی خۆبەختکردنی شۆڕشگێڕانە، کە تایبەتمەندیی هاوڵاتیی تاکی کردبووە قوربانیی بەرژەوەندییەکانی هەمووان، بۆ ستەمکارییەک بەناوی میللەتەوە و ڕەتکردنەوەی تایبەتی لەبەر خاتری ئەو گشتییەی یاساکانی کاتی نائاسایی و ئەوانیتر دەیان سەپاند. هەروەها یەکێتیی نیشتمانی کە پێویستە باری بەرگریکردن لە قەوارەی نیشتمانی دژی دوژمنی دەرەکی پێکبهێنێ، کە شۆڕشی فەڕەنسی بەرنگاری ببوەوە و سەرکەوتبوو بەسەریدا و ببووە مایەی خەملاندنی چەمکی نەتەوەی یەکگرتنخواز، بەبێ چەند دامەزراوەیەکی دیموکراتی و چەند ڕێسایەک بۆ کۆنترۆڵکردنی یاسادانان، دەگۆڕێت بۆ یەکێتییەکی نیشتمانی دژی هاوڵاتیی تاک و مافەکانی.

یەکێتیی نیشتمانی لە سەرەتادا پەیوەندیی

بە بەرەنگاربوونەوەی مەترسییە دەرەکییەکانەوە هەبوو. دەبێت ئەوەش بڵێین، ئەم مەسەلەیە زۆر گرنگ بوو، چونکە لویسی شانزەیەم سەری پەڕینرا لەبەرئەوەی خائین بوو، دەستی لەگەڵ دەوڵەتە ئەوروپییەکانی تر تێکەڵکردبوو بۆ داگیرکردنی فەرەنسا لە دژی شۆڕش، نەک لەبەرئەوەی ستەمکار بوو. واتە ستەمکاری بۆخۆی هۆکارێک نەبوو وا لە شۆڕشی فەرەنسی بکات بڕیاری لەسێدارەدان بەسەریدا بدات. ئەو تاوانەی شایستەی لەسێدارەدان بوو، خیانەتکردنی پاشا بوو لە ڕێگەی دەستتێکەڵکردنەوە لەگەڵ هێزە بیانییەکاندا. خیانەت تاوانی شا شارلی یەکەمیش بوو، کاتێک پەرلەمانی ئینگلیزی بە سەرۆکایەتی کرۆمویل بڕیاری لەسێدارەدانی بۆ دەرکردبوو. پێویستە دیموکراتخوازەکانی عەرەب سوود لەو ئەزموونانە وەربگرن، لەبەر بایەخی قوڵی مەسەلەی نیشتمانی لە کاتی بنیاتنانی دەوڵەتی دیموکراتیدا. بەڵگەنەویست بوو شۆڕشەکان دەست لەگەڵ دوژمن تێکەڵ نەکەن، لەوەش زیاتر لەو کاتەوە ئەو تاوانەی بووە هۆی سەپاندنی ئەوپەڕی سزا بەسەر پاشادا، هاوکاریکردن بوو لەگەڵ دوژمنی بیانی.

سیستەمی ستەمکاری، وەک شۆڕشگێڕەکان تێدەگەن، ئەو شێوەیەی حکومەتە کە هاوڵاتیان

لە گۆڕەپانی گشــتی دووردەخاتــەوە بــۆ بوارە تایبەتییەکانی خۆیان و داوایان لێ دەکات «سەرقاڵی کاروبارەکانی خۆیان بن». بەم مانایە، شۆڕشی دژی ستەمکاری، ڕامالّینی خەڵکە بۆ ناو فەزای گشتی و بەشداریکردنیانە لە کاروبارەکانی خۆیان و دیاریکردنی چارەنووسی خۆیاندا. هاندەرە تایبەتییەکانی خەڵک وەک تاک هەرچییەک بێت، ئــەوەی وادەکات ئەوە شــۆڕش بێت، بەرژەوەندییــە تایبەتیەکانی خەڵک نییە. بۆیە مافی «داواکردنی بەختــەوەری»، کــە جاڕنامەی ســەربەخۆیی ئەمریکا باسیکردوە و وەک یەکێک لە مافەکانی مــرۆڤ دووپاتیکردۆتەوە، لە باری شۆڕشەکاندا «بەختەوەریی گشتییە»، ئەگەر دەربڕینەکە ڕاست بێت. ئەوەی کاتی بەشداریکردن لە هێنانەدیی سوودی گشتیدا، کە بەرهەمی بەختەوەریی گشتییە، گوزارشتی لێ کراوە. ئەم بەشــداریکردنە لە دروستکردنی سوودی گشــتیدا، لە ڕێگەی فەزای گشــتییەوە، لە نەریتی شــۆڕشــە دیموکراتیەکاندا بنچینەی کارچاکییە (Public virtues).

میللەت لە فەڕەنسا ڕێکخراونەبوون، یان وەک هیچ جۆرە قەوارەیەکی سیاسی- کۆمەڵایەتیش پێک نەهاتبوون، بەئەندازەی ئەوەی گیرۆدەی دەستی دامودەزگا ڕایەڵەکارەکان (تەقلیدیی دەرەبەگانە) و سیستەمە زۆردار و بێسنوورەکانی بەربژێرییەکانیان

بوون. ئەمەش قەیرانی هەموو ئەو دامەزراوانە بوو کە لە سەرەتادا هێزیان لە میللەتەوە بەدەستدەهێنا، چونکە خاوەنی ئەو ڕەوایەتییە نەبوون کە دەسەڵات دەیبەخشێت. ئەوانە بەهەڵەداچووبوون، کاتێک پێیانوابوو دەسەڵات/هێز و یاسا لە هەمان سەرچاوەوە هەڵدەقوڵێن. ئەوانە توانای یاســادانانیان هەبوو، بەڵام خاوەنی دەسەڵاتی پێویست نەبوون بۆ پێکهاتن یان پێکهێنان. مەســەلەکە پێویســتی بە ماوەیەکی درێژ هەبوو، هەتاکــو (ئەنجومەنی دامەزرێنەران) لە فەرەنســا بەشــێوەی پەرلەمانێک گەڕایەوە و ڕەوایەتیی خۆی لە میللەتەوە بەدەستدەهێنا. کەچی لە ویلایەتــە یەکگرتووەکانی ئەمریکــا دانیشتوانی کۆلۆنییەکان لە چەندین دەستەی خۆبەڕێوەبەردنی وەهادا خۆیان ڕێکخستبوو، کــە پێش سەربەخۆیی حوکمیدەکردن. لێرەوە دەکرا چەند دەستەیەکی نوێ دەسەڵاتی خۆیان لــە ڕەوایەتیی چەند دەستەیەکی تری باوەوە بەدەستبێنن. لە فەرەنسا پاشا خاوەنی سەروەرییە، لایەنی ڕووناکیبەخشی ستەمکارییەکەی ئەوەیە، کە نمایندەی بەرژەوەندییە گشتییەکان بێت، بێجگە لەمە شــتەکانی تر بەرژەوەندیی تایبەتین. سەرەنجام هەموو ئەو دەســتانەی لەســایەی ئەودا دامەزراون تایبەتین و ناکرێت بە دەستەگەلی گشتی دابنرێن، تەنانەت ئەگــەر چەنــد دامەزراوەیەکی

وەک کۆمەڵە پیشەکارەکان و ئەوانیتریش بن. لێرەوە گواستنەوەی سەروەری بۆ نەتەوە، مانای دامەزراندنییەتی لە «گشتێک»ی نوێدا، کە گشتێک نییە لە «تایبەتی»ی پاشادا بەرجەستەبێت. ئەم پرۆسەیەش پێویستی بە پێکهاتن و پێکهێنانە، واتە پرۆسەیەک یان دینامیکییەتێکی مێژووییە و سەرەتای نییە، سەرچاوەیەکی ڕەوایەتییە پاش تێکشکاندنی سەرچاوەی ڕەوایەتیی یەکەم (واتە مافی خواوەندی) و سەرچاوەی ڕەوایەتیی دوەم (واتە سەروەریی پاشا). قەیرانەکەش لە خاڵی سەرەتادایە: کێ ڕەوایەتی دەداتە ئەوەی دەستوور دادەڕێژێت؟ کێ ڕەوایەتی دەبەخشێتە ئەنجومەنی دامەزراندن؟ کێ ڕەوایەتی دەداتە ئەوەی داوای هەڵبژاردنەکان و یاسای هەڵبژاردنەکان دەکات؟ بەڵام کاتێک دیموکراسی دەستدەکات بە بەرهەمهێنانەوەی خۆی، ئەوا قەیرانەکە کۆتاییدێت، ئەوەش لەبەر بوونی چەند شێوازێکی ڕێکخراوەیی کە گوزارشتکردن لە میللەت و ویستی گشتی دەکەن، هەروەها لەبەر بوونی چەندین بنەمای هاوبەش کە کۆدەنگی لەسەر بەهاگەلێک پێکدێنن دەبێت یاساکان خزمەتیان بکەن و پێویستە دەستوور بەپێی ئەوان دابڕێژرێ و بە ئاشکرا گوزارشت لە یەکتری بکەن. تەنانەت لە شۆڕشی فەڕەنسیدا «نەتەوە» شتێک بوو، «میللەت»یش

شتێکی تــر. نەتەوە لەوانە پێکهاتووە کە خاوەنی چەند مافێکی سیاسین و لەواقیعدا خاوەنی چەندین بەربژێرین (ئەریستۆکراسی و پیاوانی ئایینی)، بەڵام میللەت سەرجەمی ئەو ژێردەستانەیە، کە هیچ مافێکیان نییە. ئەو دوو زاراوەیە ئەنجامی گشتاندنی هاوڵاتیبوون و لەخۆگرتنی میللەت لەلایەن نەتەوەوە، واتە لەو قەوارە سیاسییەی بە دەوڵەتی نیشتمانی گوزارشتی لێ دەکرێت، یان لە خواستی ڕێکخراودا بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی نیشتمانی و کۆششکردن بۆی، پێکگەیشتن.

## دەربارەی دۆخی شۆڕشگێڕی
## یان توانای بەرپاکردنی شۆڕش

لە سەرەوە مامەڵەمان لەگەڵ چەمکی شۆڕشدا کرد، بەڵام ئەوەی زیاتر پێویستی بە توێژینەوە و لێوردبوونەوە هەیە، ئەو بارودۆخانەیە کە دەبنە مایەی بەرپابوونی شۆڕش. کەی میللەت دەجوڵێت؟ ئەگەر میللەت جوڵا، ئەوە چییە نارەزاییدەربڕین، یان ڕاپەڕینی میللی دەگۆڕێت بۆ شۆڕشێک، کە سەتاپای سیستەمی سیاسی دەکاتە ئامانج؟ پێمان وانییە ئەو پرسیارانە بەرەو تیۆرێک دەربارەی شۆڕشمان بەرن، لەو بڕوایەشـدا نین هەوڵدان بۆ دامەزراندنی تیۆرێک لەبارەی شۆڕشـەوە سوودبەخش بێت، لەبەرئەوەی زۆربەی نووسـینە تیۆرییەکان دەربارەی بابەتەکە لە شـۆڕشـێکی مێژوویی، یان چەند شۆڕشێکی دیاریکراوەوە سەرچاوەیانگرتووەوسەرنجامگیرییەکان لە چەند شـۆڕشێکی دیاریکراوەوە بەدەستدێنن و دەیان گشتێنن. ئەوانە جۆرێکن لە هەڵسەنگاندن، کە هەمیشە دەکرێت بەدرۆبخرێنەوە یان بەشێوەکی

بەردەوام گەشــەیان پێ بدرێت. بەبێ هەڵەشەیی، ســەختە ناوی تیۆر لە سەرجەم ئەو تیۆریزەکردنە بنێین، کــە ئەنجامی کۆڵینەوە لە چەندین شۆڕشی جیاوازی مێژوو کەڵەکەبوون، چونکە ئەو هۆکارە تایبەتیانەی بزووتنەوەی خەڵک و ڕاپەڕین دژی زۆرداری کۆنترۆڵدەکەن و دەبنــە هــۆی گۆڕینی بزووتنەوە و ڕاپەڕین بۆ شۆڕشێکی هەمەلایەن دژی ڕژێم زۆرن و سەختە دیارییبکرێن، هەروەها سەختە ڕۆڵی گشتی و تایبەتی تیایدا دەستنیشانبکرێت. بێگومان دەکرێت بونیادی هەر شۆڕشێک شیبکرێتەوەو چەندین سەرەنجامی تیۆریی لێ هەڵهێنجرێت، بەڵام لەو بڕوایەدا نین ئەو کۆششە ببێتە هۆی داڕشتنی تیۆرێکی هەمەلایەنی وەها، کە بتوانێت لەکۆتاییدا بەشێوەیەکی زانستی پێشبینیی بەرپابوونی شۆڕش بکات. ئێمە بەتەواوەتی بەدووریناگرین ئەو کۆششە بەشدارییبکات لە کەڵەکەکردنی ئەزموونێکی تیۆریی وەهادا، کە بتوانێت ئەگــەری بەرپابوونی شــۆڕش لە یەکێک لە وڵاتەکاندا زاڵبکات، بەڵام تەنیا وەک ئەگەر. ئەمــەش ئەو بارودۆخە زۆرانە بەدووروناگرێت کە شۆڕش تیایاندا، بەبێ چاوەڕوانیی هیچ کەسێک، بەرپادەبێت.

لە وتــارە بەناوبانگەکەیــدا «هەرەسهێنانی ئینتەرناســیونالیزمی دوەم» (٢٩) لێنیــن دەڵێت:

«شۆڕش بەبێ دۆخێكی شۆڕشگێڕی مەحاڵە، بەڵام هەموو دۆخێكی شۆڕشگێڕیش نابێتە هۆی بەرپابوونی شۆڕش». ئینجا لە ڕوانگەی خۆیەوەو بەشێوەیەكی زۆر گشتی گرنگترین پێكهاتەكانی دۆخی شۆڕشگێڕی دەستنیشاندەكات:

**١ – كاتێک دێتەئاراوە كە ڕژێمە حوكمڕانەكان ناتوانن بەبێ گۆڕانكاری حوكمڕانی بكەن و كاتێک قەیرانێک سەرهەڵدەدات كە دەبێتە مایەی ململانێكان لەناو چینی باڵاداو ململانێ و لێک جیابوونەوەكان بەرچاو دەكەون. لێرەشدا بۆ سەرهەڵدانی ئەو دۆخە تەنیا ئەوە بەس نییە «چینەكانی خوارەوە» (واتە حوكمڕانیكراوەكان) نەیانەوێ بە شێوازی كۆن ژیان بەرنەسەر، بەڵكو پێویستە مەحاڵ بێت «چینە باڵاكان»یش (واتە حوكمڕانەكان) بەشێوازی كۆن بژین.** ئەم پێناسە لێنینییە تا ڕادەیەكی زۆر پێناسەیەكی بازنەییە. ئەمەش مانای ئەوەیە، چەندین بەهەڵەداچوونی لۆژیكی لەخۆدەگرێت. چونكە بۆ ئەوەی مەحاڵ بێت چینە باڵاكان بە «شێوازی كۆن» بژین، دەبێت چینەكانی خوارەوە گوزارشت لەوە بكەن كە نایانەوێ بەشێوازی كۆن ژیان بەرنەسەر. ئاشكرایە مەبەستی لێنین لە چینەكان لەواقیعدا گشت چینە ئابوورییەكانە، بەو بەشەیشەوە كە ڕاستەوخۆ یان لە ڕووی سیاسییەوە حوكمڕان نییە. هەروەها ئەو بارودۆخانەی سەخت

دەبێت بەشێوازی کۆن حوکمڕانی بکرێت، بریتییە لە جەنگ و قەیرانی ئابووری و هەژانە مەزنەکان، کە لێنین لە بەرەبەیانی شۆڕشی ڕووسیدا پێی زانیبوون.

**٢ – کاتێک پێوەنالاّندنەکانی چینە چەوساوەکان ڕیزپەڕانە زیاتردەبن.** ئەم مەسەلەیە بەکردەوە لە ڕووسیای پاش یەکەمین جەنگی جیهانیدا هەبوو، بۆیە لێنین خستییە ناو پێناسەکەیەوە دەربارەی دۆخی شۆڕشگێڕی. ئەمەش هەمیشە لە جەنگەکانو دوای جەنگەکان، دۆخەکانی وشکەساڵی و برسێتی، بارودۆخەکانی قەیرانی ئابووری توند و تەنانەت پاش کارەساتە سروشتییەکان پێشدێت.

سەبارەت بە پێکهاتەی دووەمی پێناسەی دۆخی شۆڕشگێڕی، ئەزموونەکانی شۆڕشە عەرەبییەکان سەلماندویانە، مەسەلەی پێوەنالاّندن بۆخۆی تەنیا بارێکی بابەتی نییە، بەڵکو گرێدراوی هۆشمەندیی سیاسیشە بەرامبەر بە پێوەنالاّندنەکە. بە دەربڕینێکی وردبینانەتر: گرێدراوی هۆشمەندییە سەبارەت بەوەی لەڕاستیدا ئەو پێوەنالاّندنە بەرهەمی زوڵمە، نەک بارێکی سروشتی یان دەرهاویشتەیەکی کۆمەڵایەتیی ڕووت. بۆیە دەشێت باری کۆمەڵایەتی ئابووریی وەک خۆی بمێنێتەوە، یان لە قۆناغێکی دیاریکراودا باشتربێت، بەڵام ئەگەر چاکبوونەکە هاوکات بوو لەگەڵ زۆربوونی هۆشمەندی پێی، وەک

پێوەنالاندنێک ئەنجامـی زوڵملێکـردن یان نەبوونی دادپـەروەری و ویژدان، ئەوا پێوەنالاندن زۆردەبێت، بەبێ ئەوەی بەپێویست ببێتە مایەی تێکچوونی بەرچاوی باری خەڵک. وەک ئەوەی هەمیشە یەکسەر دوای جەنگەکان، یان لـە قەیرانـە ئابوورییەکاندا ڕوودەدات. کاتێک ئـەوە دەڵێین، مەبەسـتمان بێبایەخکردنی ئەو گەشـەکردنانە نییـە، کە دەشێت پاڵ بە خەڵکەوە بنێن بۆ ڕاپەڕین.

**٣ – کاتێک چالاکی و بێزاریی چینە چەوساوەکان ئەنجامی قەیرانەکەو ڕەفتارەکانی چینە چەوسێنەرەکان زۆردەبن**. ئەم خاڵەش مامەڵە لەگەڵ هۆکاری خۆیی دەکات، کە پەیوەندیی بە چالاکی و هۆشمەندییەوە هـەیـە.

بێگومان پێکهاتەی یەکەمی دۆخی شۆڕشگێڕی بەسـە بۆ سـەرهەڵدانی پێویسـتیی ئەنجامدانی چاکسازی، بەڵام ئەو دۆخە شۆڕشگێڕییەی دەبێتە هۆی بەرپابوونی شۆڕش، ئەوا لانی کەم پێویستی بە کۆبوونەوەی دوان لەو سێ هۆکار هەیە. پێویستە لێرەدا ئـەوە دووپاتبکەینەوە، کـە پێوەنالاندن و بەدیکردنی دەستدان و پێویستیی گۆڕانکاری، یان ئەوەی ناویدەنێین «توانای بەرپاکردنی شۆڕش»، مەسەلەیەکە پەیوەندیی بە هۆشمەندییەوەیە. چونکە پێداویستی لای هیگڵ وەک بارێکی هۆشمەندبوون

بەرامبەر بە نەبوونی شتێک سەرهەڵدەدات، واتە «هۆشمەندییە بەرامبەر بەنەبوون». «توانای بەرپاکردنی شۆڕش»یش لە پێناسەکەماندا، هۆشمەندبوونە بەرامبەر بەوە کە باری پێوەناڵاندن باری زوڵملێکردنە، واتە هۆشمەندبوون بەرامبەر بەوەی هیچ پاساوێک بۆ پێوەناڵاندن نییە و پێوەناڵاندن بارێکی سروشتیی نییە. لەهەمان کاتدا هۆشمەندبوونە بەرامبەر بە دەستدانی کاردانەوە لە دژی.

بەگەڕانەوە بۆ لێنین، بێگومان وەک تیۆریستێکی شۆڕشگێڕ، لەوانەیە سوودبەخش بێت لە پێناسەکردنی دۆخی شۆڕشگێڕیدا- ئەگەر زاراوەکانی لێنینمان بەکارهێنا- بڵێین ئەو دۆخە ئەنجامی باری چینی کرێکار بەتەنیا سەرهەڵنادات، بەڵکو پێویستە چینی حوکمڕان بکەوێتە ناو باری قەیرانەوە (بۆرژوا لە ڕوانگەی سەردەمەکەی خۆیەوە)... پێدەچێت ئەو قەیرانە لە ڕوانگەی سەردەمەکەمانەوە مانای لێک جیابوونەوەی بەکردەوە بێت لەناو بینینی بەرژەوەندیی چینی حوکمڕاندا، کە دەبێتە مایەی چەندین هەڵسوکەوتی جیاواز لەناویدا و لەکاتی بەرپابوونی شۆڕشدا. پێویستە لەسەرمان باسی ئەوە بکەین، کە شۆڕشی مارس/ئازاری ١٩١٧ دەستپێک بوو بۆ شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧و بووە هۆی ئەوەی بەلشەفیکەکان لە ڕێگەی هێزەوە دەسەڵات بگرنە

دەســت. لەبەرئەوەی پاش شــۆڕشــی مارس (لە ڕۆژژمێری ڕووسیدا و شۆڕشی نیسان لە ڕۆژژمێری زایینی گریگۆریدا، هەروەهــا شۆڕشی ئۆکتۆبەر کە شۆڕشی نۆڤەمبەرە) دەسەڵاتی دووجەمسەری لەنێوان حکومەت (کە لێنین بە بورژوایی ناویدەبرد)- واتە حکومەتەکەی کیرنسکی- لەلایەک و سۆڤێتاتەکان- واتە ئەنجومەنەکان (مەبەست ئەنجومەنی کرێکارانو سەربازەکانە)- لەلایەکی ترەوە سەریهەڵدا. بەرامبەر بەم دووجەمسەرییە سۆڤێتاتەکان پێویست بوو بەهێز مەسەلەی شــۆڕش یەکلابکەنەوە، هەتاکو دەسەڵات بەتەواوەتی ببێتــە «دەســەڵاتی ئەنجومەنەکان». لێرەوە دروشــمەکەی لێنین بریتی بوو لە «گشــت دەسەڵاتەکان بۆ سۆڤێتاتەکان». لەڕاستیدا دروشمی «گشت دەسەڵاتەکان بۆ سۆڤێتاتەکان» دروشمێکی گومڕاکەر بوو و دەمامک بوو بۆ دروشمە ڕاستەقینەکە: «گشت دەسەڵاتەکان بۆ بەلشەفیەکان». چونکە ئەو ئەنجومەنانە حیزبی نەبوون، بەڵام شۆڕشی ئۆکتۆبەر بەناوی ئەنجومەنەکانەوە دەسەڵاتی لە بەرژەوەندیی بەلشەفیکەکاندا یەکلاکردەوە، ئینجا بەلشەفیکەکان بەهێز هەمــوو بزووتنەوەیەکی ســەربەخۆیانەی ئەو ئەنجومەنانەیان لەناوبرد.

نازانین لە ڕووی مێژووییەوە چی ڕووی دەدا، ئەگەر شــۆڕشی مارس لەبری شــۆڕشی ئۆکتۆبەر

ڕیفۆرمی سیستەمی حوکمڕانیی پیادەبکردایە؟ لەوانەبوو سیستەمێکی دیموکراتی یان نیمچە دیموکراتی دابمەزرابایە، بەڵام شۆڕشی بەلشەفی، کە دووجەمسەریی دەسەڵاتی بەهێز یەکلاکردبۆوە، سیستەمێکی دیکتاتۆریی سەرتاپاگیری دامەزراند. بەگەڕانەوەش بۆ تیۆری دۆخی شۆڕشگێڕانە، دەکرێت حکومەتەکەی کیرنسکی وەک گوزارشتکردن لە لێک جیابوونەوەی چینی بۆرژوا، لەنێوان هاوپەیمانێتیی ڕژێمی پاشایەتی و یاخیبوون لێی، دابنرێت.

سەبارەت بە «شۆڕشە عەرەبییەکان»ی ئێستا دەکرێت بوترێت، ئەنجامی لێکەوتەکانی شۆڕش بەشێوەیەکی ڕوون لێک جیابوونەوە لەناو چینی حوکمڕانی میسردا- بەواتای فراوانی ئەو چینە- لەسەر میراتگریی حوکمڕانی لە کۆمارداو دەربارەی بژارە دەرەکییەکانی وڵات ڕووی دا. بێگومان بەشداریکردنی توێژە حیزبی و سیاسییەکان لە بواری کارەکاندا بووە هۆی سەرهەڵدانی ململانێکان لەسەر قۆرخکردن لەناو چینی ئابووریی حوکمڕانداو هێنانەپێشەوەی چەند توێژێک لەبەر نزیکایەتیان لە خێزانی حوکمڕانەوە. سوپا هەڵوێستێکی خراپی ڕوونی بەرامبەر بە بیرۆکەی میراتگریو زۆربوونی دەستڕۆیشتنی بزنزنمانەکان هەبوو (ئەمەش ناکۆک نەبوو لەگەڵ ئەوەی سوپا لە میسر یەکێک بوو لەو توێژانەی زیاترین سوودی

لە گەندەڵی وەرگرتبوو، بەتایبەتی پاش فراوانبوونی کەرتی ئابووریی سەربازی). پێش شۆڕشیش گرەوی نەیارانی میراتگریی پۆستی سەرۆک کۆمار بۆ کۆڕەکەی لەسەر ئەوە بوو، کە سوپا قبوڵی ناکات. ئەوەش وایکرد ئەو توێژانە بەشێوازی جۆربەجۆر لەو پەراوێزەدا گوزارشت لەخۆیان بکەن کە بۆ ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە دەوڵەتەکانی وەک میسڕ، تونس، مەغریب، ئۆردن و ئەوانیتر ڕەخسابوو، بەڵام گەورەترین و چارەنووسسازترین گوزارشتکردن بریتی بوو لە یاخیبوونی سەرکردایەتی سوپا لە فرمانەکانی سەرکردایەتی سیاسی لە ساتەوەختی مەترسیدارداو ڕەتکردنەوەی تەقەکردن لە خۆپیشاندەران و ئینجا لایەنگیریکردنی شۆڕش.

لە باری شۆڕشە عەرەبییەکاندا ئەوە سەلما کە سەختە، بەبێ لێک جیابوونەوەی چینی حوکمڕانو لادانی سوپا یان بەشێک لە سوپا بەلای شۆڕشدا، دەسەڵات بگیرێتە دەست. کاتێک ئەوەش ڕووی نەدا، دەسەڵات وەک قەڵایەکی پۆڵایینی وەها مایەوە کە تیخکردنی سەخت بوو، تەنانەت ئەگەر هەندێک فەرمانبەر و بەرپرسیش جێیانهێشتبێ. ئەوەش بووە هۆی ئەوەی شۆڕش لە باری لیبیادا بگۆڕێت بۆ بزووتنەوەیەکی چەکداری و پەنا بۆ دەستوەردانی دەرەکی ببرێت.

لێرەوە بژارەکان بریتی بـــوون لە:

١- شـــۆڕش ببێتە هۆی لێک جیابوونەوەی چینی حوکمڕان و تیخکردنی ڕژێم، جا هەرسدەهێنێ یان ڕیفۆرم دەستپێدەکات. ئەمەش بەشێوەیەکی تایبەتی بۆ دەوڵەتـــە خاوەن دامەزراوەکان ڕاستە، لەوانە ســـوپای خاوەن نەریتـــەکان کە ڕازی نابێت بکرێتە پۆلیسی ســـەرکوتکردن. ئەمانەش بەگشتی ئەو دەوڵەتانەن، کە دەکرێت تیایاندا وەلا بۆ دەوڵەت و وەلا بۆ ڕژێم لێک جیابکرێنەوە.

٢- کەوتنە ناو سازشێکی درێژخایانەوە، کە لەژێر فشاری بەردەوامی شـــۆڕشی شەقامدا دەبێتە مایەی چاکسازیی وردەوردە.

٣- پەنابردن بۆ دەستوەردانی دەرەکی، کە پڕ مەترســـیی زۆر گەورەیـــە بۆ سەر چارەنووس و سەروەریی وڵات و یەکگرتوویی میللەتەکەی.

دۆخی شۆڕشگێڕانە لە دەوڵەتە عەرەبییەکان، بەتایبەتی لە میسر و تونس، بووە هۆی بەرپابوونی شۆڕش، چونکە شۆڕشێکی میللیی ڕاستەقینە سەریهەڵدا، بەڵام هێزێکی سیاسیی ڕێکخراو نەبوو بەکاریبهێنێ بۆ دەســـەڵاتگرتنە دەســـت بەهـــۆی هێزەوە، بەڵکو چەند ڕاپەڕینێک سەریانهەڵداو گۆڕان بۆ شۆڕشێکی میللی دژی ڕژێم، کە داوای ڕووخاندنی ڕژێمیـــان دەکرد، بەبێ ئەوەی هێزێکـــی ســـیاسیی

ڕێکخراو جێی بگرێتــەوە. لێرەدا سوپا یاخیبوو و ئامادەنەبوو ڕاپەڕینــە میللییەکان سەرکوتبکات، سەرەنجام ڕژێم لە میســر و تونس دەســتی بەرزکردەوە و قوربانیدا بەهەندێک لە کۆڵەکەکانی خۆی، گرنگترینیان سەری ڕژێمەکە بوو. ئینجا دوای شۆڕش چاکسازیی سیاسیی ڕژێمی باو لەژێر فشاری جەماوەری شەقامدا دەستپێکرد، هەتاکو ڕێڕەوی گۆڕانکاریی دیموکراتیانە بگرێتەبەر.

شۆڕشە عەرەبییەکان مۆدێلێکی نوێیان خستەڕوو، کە هێشتا کامڵ نەبووە و تەنانەت پێچەوانەی چەنــد هەوڵدانێکی توێژینەوەخوازی تاڕادەیەک درەنگوەختیشــە لــە خــودی میسرڕدا ســەبارەت بە دیاریکردنــی خەســڵەتەکانی ئەو هەلومەرجانەی دەبنــە مایەی بەرپابوونی شۆڕش. بێجگە لە مەرجە گشتی و بەڵگەنەویستە باوەکانی ناو ئەمجۆرە هەوڵدانــە تیۆریانە، وەک «بوونی ناکۆکیی کۆمەڵایەتیی سیاسی نێوان حوکمڕان و حوکمڕانیکراوەکان»...، «دەستەپاچەیی دەسەڵات لەئاست چارەسەرکردنی ئەو ناکۆکییەدا» و «خواستی خەڵک بۆ گۆڕانکاری»... ئــەوا پێوانەکانی وەک «بوونی گرووپێکی نهێنی یان ئاشــکرا»، حزبێک یان بەرەیەک، کە کۆششدەکات بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیی باو لە بەرژەوەندیی خۆیدا، بەپێی ئەوەی

بەرژەوەندییەکانی هێزە بەشدارەکان گوزارشتی لێ دەکەن... و «هەڵبژاردنی ساتەوەختی گونجاو یان هەلومەرجی لەبار بۆ دەسەڵاتگرتنەدەست» (٣٠) ئەو پێوانانەن کە شــۆڕشە عەرەبییەکان ڕەتیاندەکەنەوە. چونکــە هیــچ شــۆڕشێک بەهــۆی حیــزبێکی سیاسیی ڕێکخراوەوە بەرپانەکرا، کە کۆششدەکات بۆ دەسەڵاتگرتنە دەست و بەدوای ساتەوەختی دیاریکراودا دەگەڕێت. هەروەها دواتر دەرکەوت، کە ڕۆژی سەرهەڵدانی شۆڕش، «ساتەوەختی گونجاو» بوو بۆ شۆڕش، چونکە بانگەوازەکە لە بنەڕەتدا بۆ بەرپاکردنی شــۆڕش نەبوو، بەڵکو بۆ ڕۆژێکی تووڕەیی بوو لە میسر. کەچی لە تونس ڕاپەڕین بۆ هاوکاریکردن و ناڕەزاییدەربڕین لە ناحیەی سیدی بوزید دەســتیپێکرد، ئینجــا وردەوردە گۆڕا بۆ شۆڕشێکی گەورە. بێگومان ئەمە نکۆڵی لەوە ناکات، شۆڕشە عەرەبییەکان دەرفەتیان بۆ حیزبە سیاسییە ڕێکخراوەکان ڕەخساند، کە کێبڕکێ لەسەر دەسەڵات بکەنو لە داهاتووشدا دەرفەت دەڕەخسێن.

تەنانەت ئەگەر مەســەلە بەڵگەنەویستەکان بهێنینە بەرچاوی خۆمان، ئەوا دەبینین ئەوانە بەس نین بۆ چاوەڕوانیکردنی شـۆڕش، چونکە مەسەلەکە بوونی ناکۆکی نییــە لەنێوان حوکمڕانەکــان و حوکمڕانیکراوەکاندا، لەبەرئەوەی لەمجۆرە ڕژێمانەدا

هەمیشە ناکۆکییەکە لەئارادایە، بەڵکو پرسیارەکە ئەوەیە: ناکۆکییەکە چۆن دەگاتە ڕادەیەک کە ناکرێت دواتر لە چوارچێوەی ڕژێمی باودا چارەسەربکرێت؟ هەروەها چۆن خەڵک بەرامبەر بەوە هوشیاردەبن؟ ئەمانەش چەند مەسـەلەیەکی تیۆری نیـن، کە بتوانرێت هاوکێشەیەکی تیۆری بۆ چارەسەرکردنیان دابڕێژرێت، بەئەندازەی ئەوەی واقعێکی مێژووییە، لە شوێنێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازە.

دڵخۆشکەرە لێرەدا سەرنج بۆ ئەو بایەخە ڕابکێشین کە خەڵک، تەنانەت توێژەرەکانیان، دەیدەنە مەسـەلەی ڕووناکبیـری. چونکـە لـە قۆناغەکانی سـستیدا کە هەندێک جـار لایەنگرانی گۆڕانکاری دەگەیەنێتە نائومێدی، کار دەگاتە ئەوەی بێزارەکان ڕووناکبیریی میللەت بـە سـەرشۆڕکردن و ناشـۆڕشگێڕبوون تاوانباربکـەن و لە مێـژووی میللەتەکەدا ئەوانە بدۆزنەوە کە لایەنگری بیرۆکەیەکن دەربارەی میللەتێکی تەمەڵ، ئەو میللەتەی «بەدرێژایی مێژووەکەی» بەئاسـانی دەسـتەمۆکراوە، مەرایی خانەدان و دەسەڵاتدارانی کردوە، سەری شۆڕکردوە بۆ زۆرداری و بە زەلیلیو ڕیسوابوون ڕازیبووە. کاتێکیش شـۆڕش بەرپادەبێت، هەمان میللەت جەغت لەسەر کارەکان و خەسڵەتەکانی یاخیبوون و ملنەدانو ئازایەتی دەکەنـەوە، وەک ئـەوەی «بەدرێژایی

مێژوو» ئەوانە خەسڵەتەکانی ئەو میللەتە بووبن.
کتوپڕ شۆڕشگێڕ و توێژەران چەندین نموونە لەو میللەتەوە دێننەوە، کە پاساو بۆ خۆهەڵکێشانی نیشتمانیی نوێ دێننەوە.

# شۆڕش وەک بارێک
# کە توانای تەشەنەسەندنی هەیە

پاش شۆڕشی فەرەنسی، کە هەڵگەڕانەوەی پاشایانە - ئەگەر دەربڕینەکە ڕاست بێت - بەدوایداهات، شەپۆلە هەڵگەڕانخوازەکان سەرتاپای ئەوروپای تەنییەوە، بەتایبەتی دوای سەردەمی ناپلیۆنی‌و پاشەکشەکردنی داگیرکارییەکانی، کە بوونە هۆی بڵاوبوونەوەی بیروڕاکانی شۆڕشەکە. پێدەچێت ماوەی نێوان ١٨٣٠-١٨٤٨ ئەو ڕۆژگارانە بن، کە زۆر بە ڕۆژگاری ئێستای عەرەب دەچن، ئەوەش لە ڕووی بڵاوبوونەوەی بیرۆکەی شۆڕشەوەو حکومەتە باوەکان سووربوون لەسەر گرتنەبەری چەندین هەنگاوی خۆپارێزانە بۆ تێکشاندنیان، هەروەها لە ڕووی گۆڕانی شۆڕش و بڵاوبوونەوەی بیرۆکەی دیموکراسییەوە لە چوارچێوەی دەوڵەتی نیشتمانیدا بۆ پرۆسەیەک کە هەڵکشان و داکشان لەخۆدەگرێت. لە زۆر باری ئەوروپیی سەدەی نۆزدەهەمدا، دەستووری دیموکراتی لە دەوڵەتدا، دوای شکستخواردنی شۆڕش، واتە دوای

شــكســتخواردنی ڕووخاندنــی ڕژێــم، هاتـۆتـــەدی.

ئیریک هۆبزباوم دەربــارەی ئــەم قۆناغە نووسیویەتیو دەڵێت: «لە ڕێڕەوی مێژوودا، بەدەگمەن دەستەوسانی تەواوەتیی حكومەتەكان، وەك ئەوەی نەوەی پاش شۆڕشی ١٨١٥، دەركەوتووە. ئامانجی پایەبەرزی گشت ئەو دەوڵەتانەی زیاتر لە بیست ساڵ خەریكی تێكشكاندنی یەكەمین شــۆڕشی فەرەنسی بوون ئەوە بوو، ڕێگەبگیرێت لە هەڵگیرسانی دوەمین شــۆڕش، بەشــێوەی ئەوەی یەكەم یان پێشهاتنی خراپتر لەو، واتـــە شۆڕشێكی ئەوروپیی هاوشێوە. ئەمە تەنانەت بۆ بەریتانییە هاوسۆزەكانی ئەو ڕژێمە كۆنەپەرســتە ڕەهاخوازانە ڕاســتە، كـە لە سەرجەم ئەوروپادا دەســەڵاتیان گرتبۆوە دەســت و دركیان بەوە كردبوو، پێویستە خۆیان لە ڕیفۆرم لانەدەن و فەرامۆشی نەكەن، بەڵام لەهەمان كاتدا ســڵیان لە تەشەنەسەندنی مەیلی فەرەنسیو هەرگەشەكردنێكی نێودەوڵەتیی كتوپــڕی تــر دەكــردەوە. ئەگەرچی هەرگیز لە مێژووی ئەوروپیدا و بەدەگمــەن لە هەر جێیەكی تر ڕووی نەداوە مەیلی شــۆڕشگێڕانە بەو ئەندازەیە پەتائاسایانەی هەمەلایەن بێت و بەخێرایی بەهۆی پەتای خۆڕســك یــان پڕوپاگەندەكردنی ڕێكخراوەوە بەو خێراییە تەشەنەبسەنێت» (٣١).

شــۆڕشی فەرەنســی تەنیــا چەمكی دەوڵەتی

نیشتمانی - بەبوونی سنوورێکی سیاسیی ڕوون‌و خاکێکی بەردەوامەوە کە سیستەمێکی کارگێڕی‌و یاسایی دەیبردەڕێوە - بەهێزنەکرد، بەڵکو وای پێویست کرد دەوڵەت نمایندەی نەتەوەیەک بێت، کە بریتییە لە یەک گرووپی زمانەوانی. ئەمە باری فەڕەنسا بوو پاش شۆڕشی فەڕەنسی و لەسایەی ناپلیۆندا. لێرەدا سوودبەخشە بڵێین، لەوانەیە خودی ئەو فەڕەنسایەی بە ئاگر و ئاسن شێوەزارەکان و ئینتیما نەتەوەییەکانی لەناودەبرد، بۆ ئەوەی یەکگرتوویی زمانەوانی‌و سیاسیی فەڕەنسی بهێنێتەدی، دەرسی میللەتەکانی خۆرهەڵات دەربارەی مافی کەمینەکان دابدات و بە پارە و پسپۆڕ و دامەزراوەکان بەشداریبکات لە بەنەتەوەییکردنی کولتووره ناوچەییەکان و کەمینە ئایینیەکاندا.

شۆڕش تەنیا بە تواناسازیی دەوڵەتی نیشتمانیەوە نەوەستا، چونکە لە قۆناغی نێوان سەرەتاو ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا چەندین دەوڵەت و ئیمپراتۆرییەت پووکانەوە. لەکۆتایی سەدەی هەژدەیەمدا ئیمپراتۆرییەتی پیرۆزی ڕۆمانی‌و چەند کۆمارێکی وەک جەنەوا و بوندوقیە پووکانەوەو ژمارەی شار و دەوڵەتە ئازادەکانی ئەڵمانیا کەمبۆوە. هەروەها لە ساڵی ١٨١٥دا نەمسا سەرکردایەتیی هاوپەیمانێتییەکی کۆنەپەرستانەی کرد دژی ناپلیۆن‌و لە ساڵی ١٨٢٠ و دواتریشەوە خاوەنی ئەو هەڵوێستە

بوو کە داوای خامۆشکردنەوەی دەستوبردی گشت بزووتنەوە و شۆڕشەکانی دەکرد، لەپێناو پاراستنی سیستەمی باودا. ئەمەش هەڵوێستێکە تا ڕادەیەکی زۆر بە هەڵوێستی شانشینی عەرەبیی سعودی دەچێت، پاش بەرپابوونی شۆڕشەکانی میسر و تونس.

بەدەگمەن دەستەوسانی حکومەت و ڕژێمەکان لەئاست کۆنترۆڵکردنی ڕێڕەوی مێژوودا، وەک ئەوەی پاش ساڵی ١٨١٥، ڕوونبۆتەوە. چونکە ئامانجی هەموو ئەو حکومەتانەی لەنێوان ساڵانی ١٧٨٩ -١٨١٥دا دژایەتیی شـۆڕشی فەرەنسـییان دەکرد، ڕێگەگرتن بوو لە بەرپابوونی شۆڕشێکی هاوشێوە لە ئەوروپادا، کەچی شۆڕشەکە بەچەند شەپۆلێک بەردەوامبوو: شەپۆلی یەکەم لەنێوان ساڵانی ١٨٢٠ -١٨٢٤دا لە ئیسپانیا و ناپۆلی و یۆنان بوو، بەڵام تەنیا لە یۆنان سەرکەوتووبوو. ئینجا چەندین شۆڕشی هاوتەریب لە ئەمریکای لاتین هەڵگیرسان و ساڵی ١٨٢٢ بەرازیل لە پۆرتوگال جیابۆوە. لەو قۆناغەدا زۆربەی دەوڵەتەکانی ئەمریکای باشوور لەدەست ئیسپانیا ڕزگاریان بوو و چەندین ناوی وەک سیمۆن بۆلیڤار و سان مارتن و ئەوانیتر تیایاندا ناوبانگیان دەرکرد.

ئینجا ساڵی ١٨٣٠ شەپۆلی دوەم دەستپێکردو دواتریش لە ساڵی ١٨٤٨دا شەپۆلی هەرە گەورە دەستیپێکرد، کـە بـە «بەهاری میللەتان» ناونرا.

ئەم ناولێنانە لە ڕۆژهەڵاتی ئەورووپـــا و جیهانی عەرەب و شـــوێنەکانی تری دنیا و لەسەردەمی شـــۆڕشـــە دیموکراتییەکانیشدا بەکارهێنرا. ئاسان بوو بەهۆی شۆڕشی فەڕەنسییەوە ناوی «شۆڕش» لە هەمـــوو ئەوانـــە بنرێـــت، جـــا سەرکەوتووبووبن یان شکستخواردوو، زۆربەی هەرە زۆری ئەوانەش ئامادەکاری بۆ کراو و پلان بۆ داڕێژراو بوون، بەمانای گۆڕانیان لە ڕاپەڕینەکانەوە بۆ شۆڕشەکان. ئەوەش ئەو ماوەیە بوو، کە دەزگا هەواڵگرییە ناوخۆییەکانو کاری ســـیخوڕی گەشەیانکردبوو، بۆ ڕێگەگرتن لـــە بەرپابوونی ئـــەو شـــۆڕشانەی هاوشێوەی شۆڕشی فەڕەنسی بوون.

بەربڵاویی بەخشـــینی ناوی «شـــۆڕش» لەو قۆناغـــەدا بە هـــەر ڕاپەڕینێکی میللی لەکاتی ڕوودانیدا، بە بەکارهێنانی وشەی «شـــۆڕش» بۆ ناولەخۆنانی بزووتنەوە ناڕەزاییخوازە عەرەبییەکانی پاش شـــۆڕشی تونس و میســـڕ دەچێت. هەندێک لەوانە بەکردەوە گۆڕان بۆ شۆڕش، بەڵام بێگومان ئەنجامی ناولێنانەکەیان نەبوو.

لەو ماوەیەدا بزووتنەوەی «چارتییەکان» (پەیماننامەی میللەت) سەریهەڵدا و پەیمانەکە شەش خاڵی لەخۆگرتبوو: ١ – مافی دەنگدان بۆ هەرزەکان، ٢ – دەنگدان لە ڕێگەی سندوقەکانی

دەنگدانەوە، ٣- چەنـد ناوچەیـەکـی هەڵبژاردنـی یەکسان، ٤- موچـەدان بـە ئـەندامانی پەرلەمان، ٥- چەنـد پەرلەمانێکی سـالأنە، ٦- ڕەتکردنەوەی هەڵبژاردنی کاندیدەکان بەپێی موڵکەکانیان (٣٢).

ئەم بزووتنەوە بەریتانیـە گرنگـە، تەواوکەری نەریتە سیاسییە دیموکراتییە ڕادیکالییە یەعقوبییەکان بوو. هەروەها تەواوکەری ئەو بزووتنەوە ئەمریکییە بوو، کە تۆماس پین (Thomas Paine) و جێرمی بینتهام (Jereme Bentham) و ئەوانیتر نمایندەیان دەکردو داوای هەمەلایەنیی مافی دەنگدان و جیاکردنەوەی دەسەڵاتی پەرلەمانتاری و جێبەجێکردنیان لە چینە دەوڵەمەندەکان دەکرد. ئەمەش هەمان ئەو قۆناغەیە کە تیایدا توێژێکی خەڵک خەملّی، ئەوەی دەشێت ناوی شۆڕشگێڕەکانیان لێ بنرێت و پێیانوایە کاری ئەوانە شۆڕشی سیاسی بەشێوەی چەند ڕێکخراوێکی برایانەو چەند ڕێکخراوێکی نهێنیو حیزبەکان ڕێکبخەن، ئەوانەی کاردەکەن بۆ بڵاوکردنەوەی بیرۆکەی شۆڕش دژی سیستەمی کۆن لە سەرتاپای ئەوروپادا. ئەوروپا هەرگیز وەک ئەو قۆناغە سەرهەڵدانی ژمارەیەکی زۆر کۆمەڵەی نهێنیی بەخۆوە نەبینیبوو.

کاتێک مەیلی نیشتمانپەروەری و دیموکراسی تێکەڵ بەیەک بوون، مەیلەکە هاوکات نیشتمانی و ئینتەرناسیونالیستانە بوو، ئەگەرچی ئەوە ئیمرۆ

وەک دژ بەیەکیش دەربکەون. چونکە بڕوایەک لای شۆڕشگێڕەکانی ئەورووپای سەدەی نۆزدەهەم هەبوو، کە مەسەلەی میللەتان یەکێکە. بۆیە زۆرێک لەوانە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر دەڕۆیشت، بەمەبەستی خەباتکردن لەپێناو دیموکراسی و سەربەخۆیی نیشتمانی لەهەمان کاتدا. شارل مازینی (Guiseppe Mazzini) (١٨٠٥ -١٨٧٢) بەشداریکرد لە دامەزراندنی چەند کۆمەڵەیەکدا، وەک (ئیتاڵیای گەنج)، (ئەڵمانیای گەنج) و (پۆڵۆنیای گەنج) و خواستی ئەوەی هەبوو هەموو ئەو کۆمەڵانە لەناو یەک کۆمەڵەدا (ئەورووپای گەنج) کۆبکاتەوە. هەروەها بڕوای وابوو هەر میللەتێک خاوەنی پەیامێکی تایبەتییە، ئەویش بەشداریکردنی تایبەتییەتی لە هێنانەدیی پەیامێکی مرۆڤانەی گشتیدا. ناسیونالیزمیش هیچ نییە، جگە لە پەیامێکی تایبەتی لە چوارچێوەی پەیامی مرۆڤانەی گشتیدا.

بەڵام شۆڕش لەبەرئەوە تەشەنەناسەنێ، چونکە هەلومەرجی وڵاتێکی دیاریکراو تەبایە لەگەڵ ئەو دەرهاویشتانەی لە وڵاتێک بوونەتە هۆی بەرپاکردنی شۆڕش، کە دەشێت پێی بوترێ هەناردەکەری نموونە. لەبەرئەوەی تەنیا ئەنجامی سەرکەوتنی شۆڕش و بڵاوبوونەوەی سەرنجراکێشانی و خستنەڕووی تواناکانی گۆڕانکاری بەهۆی ویستی میللەت و توانای جوڵانییەوە، ئەو میللەتانەی هەست

بە زوڵم لێکردن دەکەن و لە سستی بێزاربوون، ئیلهام لە مۆدێلەکە وەردەگرن بۆ جوڵان. لێرەشدا میللەتان بابەتەکە «زنستیانە» تاوتوێ ناکەن و پێش ئەوەش هیچ بەراودێک ناکەن. بۆیە شۆڕشەکان ئەنجامی پێداویستیو گۆڕانکارییەکانی ناو ویژدان ڕوودەدەنو زۆربەی جارەکان شۆڕشەکان لەو وڵاتانە بڵاودەبنەوە، کە بەپێی هیچ تیۆرێکی ناوخۆیی یان کەڵەکەبوونێکی مەعریفی ناوەکی ئامادەنین بۆ بەرپاکردنی شۆڕش. ئەگەر بمانەوێ بەراوردێکی وێناکارانە بکەین، ئەوا دەڵێین دۆزینەوەی بزوێنەری هەڵمین، کە جێمس وات ساڵی ١٨٨٧ دۆزییەوەو دواتر ستیڤینسۆن بۆ شەمەندەفەرەکان بەکاریهێنا، پێویستی بە بەشێک لە زانستی فیزیا هەبوو کە فەڕەنسییەکان لە بیستەکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە تیایدا پێشڕەوبوون، بەڵام پێویستیەکانی بەریتانیا لە دەرهێنانی خەڵوزی کانەکان بووە هۆی گەشەپێدانی بەکارهێنانی زانستی فیزیا لە پیشەسازیدا و مایەی دۆزینەوەی بزوێنەری هەڵمین. لێرەدا سەرکەوتنەکە لەسەر دەستی میکانیکییەکی شارەزا بوو نەک فیزیازانێک، بەڵام لانی کەم سەرکەوتنێک بەدەستهات. ئێمە نازانین ئاخۆ چەند هەوڵدان لە دەوڵەتەکانی تر پێش سەرکەوتنی ئەمە تووشی شکستخواردن بوون.

لەوانەیە گونجاوبێت بۆ تیۆریزەکردن بڵێین،

شــۆڕشە ســیاسییەکان بەپێویســت لەو دەوڵەتانە سەرهەڵنادەن کە پێش ئەوانیتر شۆڕشی فیکری و تیۆری تیایاندا ئەنجامدراوە، ئەو شۆڕشەی دەبێتە مایەی پێویستیی گۆڕینی واقیعی سیاسی ڕووەو سیستەمێکی دادپەروەرانەتر، چونکــە دەشــێت پێداویســتییە سیاسییەکان و هەلومەرجی پێویستیی شۆڕشگێڕانە ببێتە مایەی چەنــد کارێک و بۆ خۆیان ببنــە هۆی سەرهەڵدانی چەند ڕێبازێکی تیۆری لەو دەوڵەتانەی بەشێک لەو تیۆرانە کارپێدەکەن کە لە دەوڵەتەکانی تر ناسراون. ئەوەش دەشێت بەئەندازەی کۆنترۆڵکردنو بەڕێوەبردنی ستراتیژی ســیاسی لەلایەن دەرهاویشتە پێنەگەیشتووەکانی گۆڕانکارییەوە ســەرکەوتوو یان سەرنەکەوتوو بێت. لێرەشدا واقیع و دەرهاویشتەکانی زیاتر لە بارودۆخە خۆڕسکەکان بکەرەکان دەبزوێنن. لێرەوە، کاتێک هەلومەرجەکان بۆ سەرکەوتنی شۆڕش پێدەگەن، خۆڕســکبوون لە بەرژەوەندیــدا دەبێت، بەڵام کاتێک شــۆڕش بەدەر لــە دەرهاویشــتەکان تەشەنەدەسەنێ، چونکە پەنجەرەی هیوای کردۆتەوەو زوڵم لێکردن لەئارادایە، ئەوا خۆڕسکبوون و نەبوونی ڕێکخستن دەبنە هۆی لەناوچوونی شۆڕش.

شۆڕش لە جیهانی خۆرئاوادا بە **سێ** شەپۆلی سەرەکی هەڵگیرسا: «شەپۆلی **یەکەم** لەنێوان ساڵانی ١٨٢٠ -١٨٢٤دا بوو و ناوەندەکانی بریتی بوون لە

دیوی ئەوروپیی حەوزی دەریای سپیی ناوەڕاست، واتە ئیسپانیا (١٨٢٠)، ناپۆلی (١٨٢٠)و یۆنان (١٨٢١). ئەم شۆڕشانە لە هەموو ناوچەکان کپکرانەوە، جگە لە یۆنان» (٣٣)، کە شۆڕشەکەی شێوەی ڕزگاربوون لە «داگیرکردنی تورکی»ی وەرگرت و بووە مایـــەی کلّپەســـەندنی ئەوروپای گشـــت نەتەوەکان و وای لەو نەتەوانە کـــرد بەپێی فۆڕمە بەناوبانگەکەی (دولاکروا)ی هونەرمەند: «ئازادی لەسەر شەقامەکان سەرکردایەتی خەڵک دەکات»و قەسیدەکانی (لۆرد بایرۆن) لە دوای شـــۆڕشـــەوە ڕیزببەستن. ئینجا شەپۆلی **دووەمی** شۆڕش لەنێوان ساڵانی ١٨٢٩و ١٨٣٤دا دەستیپێکرد، بۆ ئەوەی ئاسەوارەکانی لە گشت ناوچەکانی ئەوروپا و خۆرهەڵاتی ڕووســـیا و کیشوەری ئەمریکای باکور جێبهێڵێ« (٣٤). ئەنجامی ئەم شەپۆلە، هێزەکانی بورژوا ئەریستۆکراتیەتیان لە ئەوروپای خۆرئاوا دووچاری تێکشکانێکی خراپ کردو ئەو بوارژوایە توانیی ڕەواج بداتە چەند سیاسەتێک، کە بەریەککەوتنیان لەگەڵ بزووتنەوە داخوازیارەکانی مافی دەنگدانی گشتی دروست نەدەکرد، «ئەگەرچی بەرەنگاری ئەو کارە ئاژاوەگێڕیانە بوونەوە کە توێژە بێزارەکانی بزنزمانەکان، یان بچووکەکانیان، یاخود وردە بۆرژواو نۆبـــەرەی بزووتنـــەوە کرێکارییەکان پێی هەڵدەستان. سیستەمی سیاسیی ئەوانەش لە

بەریتانیا و فەڕەنسا و بەلجیکا لە ڕووی ناوەڕۆکەوە هاوشـێوە بوو: چەنـد دامەزراوەیەکی لیبرالیستانە سـنووریان بـۆ مەرجەکانی دیموکراتیبوونەکەی دادەنا، کە دەبوایە لە هەڵبژێرەکاندا هەبێت، وەک خاوەندارێتی و خوێندن لەسایەی پاشایەتییەکی دەستووریدا» (٣٥). **سێیەمین** شەپۆلی شۆڕشگێڕی، کە گەورەترینیان بوو لە ساڵی ١٨٤٨دا و ئەنجامی ئەو قەیرانەی ئاسـەوارەکانی بەدرێژایی چەنـد دەیەیەک لەو کۆمەڵگە نوێیەدا کەڵەکەببوون کە بۆرژوا بەرهەمیهێنابوون. «شۆڕشەکان لە یەک کاتدا هەڵگیرسان و (بەشـێوەیەکی کاتی) لە فەڕەنسا و ئیتاڵیا و دەوڵەتی ئەڵمانیا سەرکەوتنی بەدەستهێنا. هەروەها بەشێوەیەکی پچڕپچڕ کاریگەرییان خستە سـەر ئێرلەندا و یۆنان و بەریتانیا. هیچ شـتێک وەک ئەم ڕاپەڕینە خۆڕسکانە لە چەمکی شۆڕشی جیهانییەوە نزیک نەبوو، کە شۆڕشگێڕەکان خەویان پێوە دەبینی. ساڵی ١٧٨٩ تەنیا ڕاپەڕینی تاقە میللەتێک نەبوو، بەڵکو بە «بەهاری میللەتەکان»ی کیشوەری ئەورووپا بەگشتی دەچوو» (٣٦).

دەکرێت بوترێت، جیهانی عەرەبی «تەنێکی گەیەنەری شۆڕشەکان» بوو، ئەگەر دەربڕینەکە ڕاست بێت. چونکە شۆڕشی ٢٣ی تەمموز/یولیۆی ١٩٥٢ لە میسر کودەتایەکی سەربازی بوو وەک شۆڕش ناسرا،

نەک لەبەر ئەنجامە شۆڕشگێڕییەکانیو کۆبوونەوەی خەڵک لە دەوری، بەڵکو لەبەرئەوەی لە ژینگەیەکدا سەریهەڵدابوو، کە توانای بەرپابوونی شۆڕشی تیادابوو و درێژەپێدەری بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانەی میسری بوو، کە لە چلەکانەوە لەگەڵ لیژنەکانی کرێکارانو خوێندکاران و هەڵکشــانی بزووتنــەوەکانی لاوانی یاخیبوو لە چەمکی حیزبی تەقلیدی و دژی قۆرخکردنی سیاسەت و سامان لەلایەن پیاوماقوڵان و کۆشکەوە دەستیپێکردبوو. ئینجا بەگژاچوونەوەی ئینگلیز لە کەناڵی سوێس و زنجیرەیەک یاخیبوون، کە بوونە هۆی ڕووخاندنی یەک لە دوای یەکی حکومەتەکان، هەتاکو دەگاتە ئاگرکەوتنەوەکەی قاهیرە. کودەتای ئەفســەرە ڕزگاریخوازەکــان بە «شــۆڕش» ناونرا، چونکە درێژەپێدەری ئەو شــۆڕشە بــوو، کــە لە شارەکانی میسر بەرپابوونو چەندین سەرەنجامی شۆڕشگێڕانەی لەخۆگرتبوو. دواتر بزووتنەوەی ئەفسەرە ڕزگاریخوازەکان بەشێوەی چەند کودەتایەکی خاوەن ســروشتی شــۆڕشــگێڕانە تەشەنەیسەند و تەنیا داوای لەناوبردنی ڕژێمی باویان نەکرد، بەڵکو داوای دامەزراندنی ڕژێمیکی نوێیان کرد، یەکەمین و گرنگترینیشیان شۆڕشی ١٤ی تەمموز/ یولیۆی ١٩٥٨ بوو دژی حوکمڕانیی پاشایەتی لە عیراق. دەتوانین شــۆڕشی ڕزگاریخوازی جەزائیریش لــەم ڕەوتەدا

دابنێین، بەڵام بە ڕەچاوکردنی ئەوەی تایبەتییە تیایدا، واتە شـۆڕشەکە شـۆڕشێکی ڕزگاریخوازی نیشتمانی نموونەیی بوو دژی کۆڵۆنیالیزمێکی بیانیی نیشـتەجێکاری زۆرەملێیانەی ڕاستەوخۆ. دۆخێکی شـۆڕشـگێڕانەی عەرەبی لەئارادابوو کـە بەپیری شۆڕشی ٢٣ی یولیۆوە چوو، بەڵام بە پێڕەویکردنی شێوازێک لە ڕێگەی ئەو دامەزراوە نوێ سەرەکییەی کۆڵۆنیالیزم لە دوای خۆی جێهێشتبوو و دەیتوانی میللەت یەکبخات، ئەویش سوپا بوو. دەبێت ئەوەمان لەبیرنەچێت، شـۆڕشی یولیۆ بە ڕوونی ڕەهەندێکی دژ بە حوکمڕانیی ئینگلیزی لەخۆگرتبوو.

دەکرێـت بوترێت، دۆخـی شـۆڕشگێڕیو بزووتنەوەی شـۆڕشـگێڕانە لە زۆر وڵاتـی عەرەبی هەبوون، بەڵام کودەتاکانی ئەفسەرەکان لە ڕێگەی جوڵانی دەسـتوبرد و لەژێـر کاریگەریی کارەسـاتی فەڵەستیندا لەباریانبردن. دەڵێین هاوکات لەناویانبردن و تەواویانکردن، چونکە ئەوان لە ڕێگەی دووپاتکردنەوەی گوتاری جەماوەرییەوە، بەبێ بەشداریکردنی میللەت بەشێوەیەکی مافپەروەرانەی ڕێکخراو لە سیاسەتدا، هەروەها بەهۆی بەرتەسککردنەوەی ئازادییەکان و چەسپاندنی حوکمڕانیی سەربازی بەناوی میللەتەوە، مەیلی دیموکراتیان لەباربرد، لەهەمان کاتیشدا ئەرکەکانی ڕزگاریی نیشتمانیان تەواوکرد و پێکگەیشتنی لادێ و

شــاریان هێنایەدی و بەربژێرییــەکانی دەرەبەگایەتیان هەڵوەشاندەوە. ئەوەی لێرەدا بەلامانەوە گرنگە ئەوەیە، تەشەنەسەندن لە ژینگەی ســیاســی و کولتووریدا بە ڕەهەندە جیاوازەکانیانەوە پاش شۆڕشی یولیۆ ڕووی دا، تەشەنەسەندنەکەش لە ڕێگــەی لاســاییکردنەوەی شێوازی شــۆڕشــی یولیۆ و وشــەکانیەوە بوو، وەک ئەوەی لە ئەوروپا بەهۆی لاساییکردنەوەی شۆڕشی فەڕەنسییەوە ڕووی دا.

ئەوەتا دەبینین، ئەنجامی ئــەو نموونەیەی شۆڕشگێڕەکانی گۆڕەپانی ئازادی پێشکەشیانکرد، لە دەوڵەتە عەرەبییــەکانی ســاڵی ٢٠١١ و دواتردا بەپیرەوەچوونێکی دۆخی شۆڕشگێڕی عەرەبی لە زۆر دەوڵەتدا هاتەئاراوە. بە ئەزموون و هەڵەکردنیش دەرکەوتووە، ئاخۆ تا چ ئەندازەیەک ئەم نموونەیە بۆ ئەم یان ئەو دەوڵەت گونجاوە و گەشەپێدانی چەند نموونەیەکی نوێش چەند پێویستە.

دەکرێت بوترێت، بیرۆکەکان و پرنسیپەکانی شــۆڕشی فەڕەنسی، لــە ماوەی نێــوان ســاڵانی ١٨٧٩ و ١٩١٧دا، واتە هەتاکو شۆڕشی ئۆکتۆبەری سۆشیالیستانە، بابەتی ململانێ بوو لە ئەوروپا و لەنێوان ئەو هێزانەی لایەنگری ئەو پرنسیپانە بوونو ئەوانەی دژیان بــوون. لەوێوە زۆربەی دەستەواژەو وشەکانی تایبــەت بە چەپ، ڕاســت، دیموکراسی و لیبرالیزم

گەشەیانکرد. ئەوەی هەندێک دەخوازن لەبیریبکەن ئەوەیە کە ڕواڵەت و وشەکانی دیاردەی ناسیونالیزمیش هەر لەوێوە هاتوون. چونکە شۆڕشی ١٧٨٩ بەکردەوە شۆڕشێکی نیشتمانی بوو بۆ دامەزراندنی نەتەوە. هەروەها شۆڕشەکانی ١٨٤٨یش، تەنیا چەند شۆڕشێکی دیموکراتیانە نەبوون، بەڵکو لە هەمان کاتدا چەند شۆڕشێکی نیشتمانیش بوون. لەوێشەوە بیرۆکەی یاسای دەستووری، مۆدێلی ڕێکخستنی شار، ڕێگاکانی بەڕێوەبردنی نوێ و ڕێکخستنی پێوانەی مەتری سەریانهەڵدا و سوپاکانی ناپلیۆن بەرەو ناوچەکانی تری ئەوروپا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیان بردن.

ڕێکەوت نییە قۆناغی شۆڕشە دیموکراتیەکان، قۆناغی ئەو شۆڕشە نیشتمانیانە بێت کە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا (١٧٧٦-١٧٨٣)، ئێرلەندا (١٧٨٢ -١٧٨٤)، بەلجیکا (١٧٨٧ -١٧٩٠) و هۆڵەندایە (١٧٨٣-١٧٩٥) داوای جیابوونەوەیان دەکرد. بەڕای ئێمە بیرۆکەی دیموکراسی- لانی کەم لە ڕووی مێژووییەوە - گرێدراوی بیرۆکەی دەوڵەتی نیشتمانی بووە. مەترسییەکەش لەوەدا بووە، ئەوە لە ڕووی تیۆرییەوە بگۆڕڕێت بۆ مەرجێکی دیموکراسی، واتە جیابوونەوە لە دەوڵەتو دامەزراندنی لێکچوون لەسەر ئاستی شوناس ببێتە مەرجێک بۆ جێبەجێکردنی دیموکراسی.

ئەمە بارەکە بــوو هەتاکو کاتی شەپۆلەکانی دیموکراسیی ئەم دواییانــە لــە خۆرهەڵاتی ئەورووپاو ڕووسیا و بەلقان، ئەوانەی بوونە هۆی لێک جیابوونەوەی چەندین قەوارەی سیاسی، کە لەسەر ئاستی شوناس دەگەڕان بەدوای لێکچووندا، یان لانی کەم دەگەڕان بەدوای شوناسێکی نیشتمانیی باڵادەستدا، وەک مەرجێک بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی نوێنەرایەتیکردنو هێنانەئارای فرەلایەنی سیاسیو هەڵبژاردنەکان. ئەوەش لە باری بەلقاندا بووە مایەی چەندین کارەساتو پاکتاوکردنی ڕەگەزی. لێرەدا ئێمە بۆیە باسی ئەوە دەکەین، هەتاکو هێما بۆ چەند ئەزموونێکی تری سەرکەوتوو و نیمچە ســەرکەوتوو بکرێت، لەبواری پێکهاتنــی نەتەوەی دیموکراتیدا، بەبێ پاکتاوکردنی ڕەگەزی لە بەلجیکــا، کەنەدا. وەک ئیسپانیا، بەرازیل، باشووری ئەفریقاو ئەوانیتر. هەروەهــا هەتاکو هێما بــۆ ئەوە بکرێت، پێویستە دیموکراتخوازەکانی عەرەب پاش شۆڕشەکان گەشە بە نموونەی تایبەتی خۆیان بدەن، نموونەیەک کە پشتبەستووبێت بە بنەمای هاوڵاتیبوون، دیموکراسی، فرە شوناسیو دەوڵەتی گشت هاوڵاتیان، لەبری ئەوەی برەو بە کێشمەکێشە ڕەگەزیو شوناسخوازییەکانی تر بدەن. ئەمــەش کاتێک کــە دەرفەت بۆ حکومەتێکی نوێنەرایەتی یــان چەند گوزارشتکردنێکی سیاسیی ڕزگاریخوازی تر دەڕەخسێت.

له هــەر کاتێکی تــری ڕابردوو زیاتــر له شــۆڕشــەکانەوە دەرکەوتــووە، شــوناسی عەرەبیی لەئارادایەو لە ئۆقیانووســەوە بۆ کەنــداو عەرەب کۆدەکاتەوە. شــۆڕشی هەرە گــەورە لــە جیهانی ئیسلامیدا لە ئەندونیسیا، کە بە شۆڕشی میسری دەچێت، هانی کەسی نەدا شۆڕشگێڕانە بجولێتەوە، لەکاتێکدا شۆڕش لە دەولەتێکی عەرەبیی بچووکدا- وەک تونس- وەک تەزووی کارەبا بەجەستەی عەرەبیی لاوازدا تێپەڕی و خەم و هیوا و ئەجێندا و بیرۆکەکانی گەیاند. ناکرێت هیوا و خەونی شۆڕش عەرەبیانە بگوێزرێتەوە، ئەگەر هاوبەشێکی عەرەبیانــە ولاتە عەرەبییەکان کۆنەکاتەوە. ڕاستە لە سەردەمەکەماندا نابێت شــوناس بەســەر کەسدا بسەپێنرێ، بەلام نابێت هێزی یەکخستنخوازی کۆکەرەوەی شوناسی عەرەبی فەرامۆشبکرێت، ناشبێت ئەو شوناســە لە ڕۆژگاری گۆڕانکاریی دیموکراتیانەدا دژ بە شوناسە نیشتمانییەکان دابنرێت. بەوپێیەی شۆڕش پێویستی بە گەڕانە بەدوای ئەوەی هاولاتیان لەناو دەولەتدا کۆدەکاتەوە، نەک لێکیان جیادەکاتەوە. جــا ئەگەر شۆڕش لە ڕووی بونیاد و بەرنامە و دروشمەکانیەوە لەوەدا سەرکەوتوونەبێت، ئەوا لەبری ئەوەی ببێتە مایەی گۆڕانکاریی دیموکراتیانــە، دەبێتــە هۆی سەرهەلدانی شەڕی ناوخۆ.

شۆڕشی فەڕەنسی هانی بەرپابوونی چەندین شۆڕشی دا، تەنانەت لە ئەمریکای لاتینی پاش ساڵی ١٨٠٨یش. هەروەها هانی بزووتنەوە نیشتمانییە دیموکراتیەکانی هیندستانی داو بیرۆکەکانی ڕێنسانس و مۆدێرنیتەی لە جیهانی عوسمانیدا، بەتایبەتی لە جیهانی عەرەبیی عوسمانیدا، گشتاند. عوسمانییە نوێکانی سەرکردایەتیی ئەو ڕیفۆرمانەیان کرد، کە بە «ڕێکخستنەکان» ناسرابوون و سەرنجی ڕووناکبیرانی ئەوروپایان ڕادەکێشا. نەوەی دوەمی ئەوانە کەوتبوونە ژێر کاریگەریی شۆڕشی فەڕەنسیو بەهاکانیەوە، لەپێناو بەهێزکردنی یەکگرتوویی سەڵتەنەتدا و بەمەبەستی بەرەنگاربوونەوەی دەستوەردانی ئەورووپیی بیانی، نەک بە ئامانجی بانگهێشتکردنی. هەروەها بەمەبەستی هەوڵدان بۆ خوڵقاندنی هاوڵاتیبوونێکی عوسمانیی وەها کە گشت عوسمانییەکان، بەبێ گوێدانە ڕەگەز یان زمان یاخود ئایین، تیایدا یەکسان بن، پێش ئەوەی دەستوەردانی ئاوروپی بەشدارییکات لە تێکشکاندنی پرۆژەی خودی ڕێکخستنەکاندا و لە پرۆژەیەک بۆ بەهێزکردنی یەکگرتوویی و سەڵتەنەتەوە بگۆڕێت بۆ ئامرازی هەڵوەشاندنەوەی. لە یەکەمین قۆناغی ڕزگاریی نیشتمانیدا، لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، ژمارەیەک نیشتمانپەروەر ئیلهامیان لە بەهاکانی

شۆڕشی فەڕەنسی وەرگرت. ئەی دروشمی شۆڕشی مەزنی سـوریا (١٩٢٥–١٩٢٧) ئازادی و برایـەتیو یەکسانی نەبوو، کـە هەمان دروشـمەکانی شۆڕشی فەڕەنسیی مەزن بوون؟

بێگومـان ناکرێت لاسـایی خاڵی سـەرەتا بکەینەوە، چونکە شـۆڕشی فەڕەنسی خۆڕسـکانە هەر گەشەی نەرکردوە بۆ شۆڕش، بەڵکو ئەوەی شۆڕشەکەی بەرپاکرد، لەواقیعدا هەوڵدانێک بـوو چەند نییەتێکی پێچەوانەی ڕەوتی شۆڕش هانیان دا، ئەویش هەوڵدانی ئەریستۆکراسی بوو بۆ کۆبوونەوەی ئەنجومەنی گشـتیی دەرەبەگایەتی، کـە لە ساڵی ١٦١٤ەوە لەکارکەوتبوو، وەک ئـەوەی بیرۆکـەی نوێنەرایەتیکردن و مەسەلەی کێ نمایندەی میللەتە دەربڕێ. ئەم ئارەزووەی کۆبوونەوەی ئەنجومەنەکە لەلایەن ئەوەی پێیدەوترا «چینی سـێیەم» گۆڕا بۆ شـۆڕشێک بەمەبەسـتی بەدەسـتهێنانی مافی نوێنەرایەتیکردن و بەڕێوەبەردنـی کاروبارەکـان. ئـەو توێژانەی خوازیاری گێڕانەوەی بەشداریکردنی دەرەبەگـە کۆنەکان بوون لە حوکمڕانیی وڵاتدا و دژی پاشایەتیی ڕەها بوون، بەرپرسیارن بەرامبەر بە کاتی شۆڕەکە، نەک هێزە نوێکان. ئەوە ئەوان بـوون بیرۆکەی بەشـداریکردن لـە کاروبارەکانی وڵاتیان دەربڕی، کەچی ساڵی ١٧٨٩ چەند هێزێکی

کۆمەڵایەتیی نوێ قۆستیانەوە کە ساڵی ١٦١٤ لەئارادانەبوون.

چەمکی نەتەوە بەگشتی گۆڕانی بەسەردا هاتووە، لە وەجاخزادەوە بۆ ئیکلیرۆس، چینی سێیەم یان ئەوەی دواتر پێیوترا بۆرژوا یاخود چینی ناوەڕاست و چەندین ناوی تری لێنرا، زۆری پێ نەچوو فراوانبوو بۆ ئەوەی گشت هاوڵاتیان لەخۆبگرێت. «چینی ناوەڕاست»، کە بەشێک بوو لە زۆربەی خەڵک، کەوتنە ژێر کاریگەریی «بیرۆکەی فەیلسووفەکان» (ئەمەش بە ڕۆشنگەرەکان دەوترا)و «ئابووریناسەکان» (ئەمەش بە فیزیۆکراتەکان دەوترا) و تەنانەت بیرۆکەی کۆمەڵەکانی خانوسازە ئازادەکان (ماسۆنییەکان)، کە ڕێکخستنەکانی وەک کەڕوو بڵاوبوونەوەو زاڵبوو بەسەر بواری پیشەیی و ڕووناکبیریی پاریسی هەشتاکانی سەدەی هەژدەهەمدا. شۆڕش لە پاشایەتیی دەستوورییەوە گەشەیکرد بۆ کۆماری، ئەمەش دوای ئەوەی پاشای فەڕەنسا لە حوزەیران/ یونیۆی ١٧٩١دا هەوڵی دا لە وڵات هەڵبێت، کە بە دەستبەرداربوونی میللەت دانرا، بووە هۆی بەرزبوونەوەی ڕادەی مەیلی کۆمارخوازیو بەهێزبوونیو فراوانبوونی قەبارەی کاریگەریی لەچاو پاشایەتیی دەستووریدا، کە مەیلی سەرەکیی شۆڕش بوو. لەگەڵ فراوانبوونی مەیلی کۆمارخوازی، میللەت دەستبەرداری

پاشـا بوون، پاش ئەوەی پاشـا دەستبەرداری ئەوان بوو. شـۆڕشی فەرەنسی کاریگەریی بروسکەئاسای لەسەر سیستەمی کۆن هەبوو، سەخت بوو ئەم توخمە کتوپڕە بروسکەئاسایە لە باقی ناوچەکانی ئەورووپادا بگەرێنرێتـەوە. پاش ئـەوەی زاڵیش بوو بەسـەر سـیستەمی کۆنی واقوڕماودا، کە بەناڕەحەتی درکی بە ڕووداوەکان دەکرد، شـۆڕش ڕاستەوخۆ ڕوویکردە بەرگریکردن لەخۆی، لە ڕێگەی بەرپاکردنی جەنگەوە دژی ئەو سوپا بیانیانەی هاتبوونە ناو وڵاتەوە. ڕاستە شۆڕش ئەنجامی ئەوە سوپایەکی نیشتمانیی شۆڕشگێڕ و نموونەی دەوڵەتێکی ناوەندیی بنیاتنا، بەڵام ئاکامی ئەو نموونەیە پشـتیوانەیەکی (ڕەسـیدێکی) پوختی یەکگرتوویی و یەکڕیزیی نەتەوە بوو، لە دەوری ئەو هاوڵاتیبوونەی تەماهی لەگەڵا نیشتمانپەروەریتی یان ناسیونالیزم دەکات.

«شۆڕشی فەرەنسی جەنگی هەمەلایەنی دۆزییەوە یان داهێنا، واتە کۆکردنەوەی گشت دەرامەتەکانی نەتەوە لە ڕێگەی سەربازگیری، یاساکاری، پیادەکردنی کۆنترۆڵکـردنی توندوتۆڵی ئابـووری، نەهێشـتنی جیاوازییەکانی نێوان سەربازەکان و مەدەنییەکانەوە، واتە نەهێشتنی بەربژێرییە چینایەتییەکانی سوارچاکەکان... ترسـناکیی سـەرەنجامەکانی ئـەم دۆزینەوەیە لەم سـەردەمە مێژووییـەدا ڕوونبۆوە، چونکـە ئەگەرچی

جەنگە شۆڕشگێڕییەکە لەنێوان ساڵانی ١٧٩٢ و ١٧٩٤ وەک بارێکی ڕیزپــەر مایەوە، بەڵام زۆربەی چاودێران لە سەدەی هەژدەیەمدا لە ماناکەی تێنەگەیشتن و ئەو سەرەنجامانەی بەدەستیانهێنا ئەوە بوو، کــە بوترێ جەنگەکان دەبنە مایەی شــۆڕشەکان و شــۆڕشەکانیش جەنگی وەها دەبەنەوە مەحاڵە ببڕێنەوە» (٣٧). بەڵام ئیمڕۆ لەوە تێدەگەین، کە مانای لەشکرگیریی نەتەوە، ڕووەکەی تری نەهێشتنی بەربژێرییەکانی خزمەتکردنی سەربازیی چینی ئەریستۆکراسی بوو و گۆڕینی بوو بۆ یەکێک لە مافەکانی هاوڵاتی. ئەمەش تێگەیشتنێکی نوێی سەبارەت بە هاوڵاتیبوون هێنایەئاراوەو بەشداریکرد لە هاوجووتکردنی میللەت و نەتەوە، هاوڵاتیبوون و ناسیونالیزمدا، کە لەلای سەرەوە باسمانکردوە. شۆڕشی فەڕەنسیو سوپاکەی، ئینجا سوپاکەی ناپلیۆن کە سەربازگیریی تەوزیمی و ڕێکخستنی نوێی پیادەکرد، بیرۆکەی هاوڵاتیبوون و سوپای نیشتمانیان گشتاندن. واتە ئەوە سوپای هاوڵاتیبوونە لە دەوڵەت- نەتەوەی ناوەندیدا، نەک سوپای چینایەتی توێژێکی دیاریکراو، مەبەست ئەریستۆکراسی یان ئەوانیترە. پێدەچێت شۆڕش ئەو بیرۆکەیەی لەشکرگیریی کۆمەڵگەی گشتاندبێت، کە گوزارشتکردنە توندڕەوەکەیمان لە ڕژێمە شۆڕشگێڕییە سەرتاپاگیرەکاندا بینیوەتەوە.

فەڕەنســا پاش شــۆڕش بــە چەندین قۆناغدا

تێپەڕی، هەتاکو سیستەمی دیموکراسی جێگیربوو. لەکۆتایشـدا ڕوونبۆوە، دیموکراسـی ڕاستەوخۆ لە شۆڕشەوە سـەرچاوەناگرێت و دیموکراسییەکان لە شۆڕشەکانەوە سەرهەڵنادەن، بەڵکو لە پرۆسەیەکی ریفۆرمەوە سەرچاوەدەگرن، کە شۆڕشی دیموکراتی ئەنجامیدەدات. خۆ ئەگەر شۆڕش ڕاستەوخۆ سیستەمی پاوانکرد، ئەوا زۆرجار سیستەمێکی توندوتیژی پاکتاوخواز سەرهەڵدەدات، کە لەکۆتاییدا نابێتە مایەی دیموکراسی، بەڵکو دەبێتە هۆی هاتنەئارای شێوازێکی دەسەڵاتخوازیی نوێ. لێرەوە دیموکراسی هەمیشە پشتبەستووبووە بە دوو پرۆسە: پرۆسەی گۆڕانکاریی سیستەمی کۆن و پرۆسەی تێپەڕاندنی کارەساتەکان و نسکۆکانی خودی شۆڕشەکان. بەو پێیەی دوای ئەنجومەنی دامەزراندن ڕۆڵی یەعقوبییەکان و ئینجا ڕۆڵی ئیدارە (١٧٩٥ –١٧٩٩)، کونسڵگەری (١٧٩٩ –١٨٠٤)، ئیمپراتۆری (١٨٠٤ –١٨١٤)، سـەرلەنوێ بنیاتنانی پاشـایەتیی ئال بوربۆن (١٨١٥ –١٨٣٠)، پاشایەتیی دەسـتووری (١٨٣٠ –١٨٤٨)، کۆماری (١٨٤٨ –١٨٥١) و سەرلەنوێ ئیمپراتۆری لەسـایەی لویس بۆناپارتدا (١٨٥٢ –١٨٧٠) هات. هەموو ئەوانە چەند قۆناغێکی هەڵگەڕانەوەخوازانە نەبوون، چونکە لە بەشێکی ئەو قۆناغانەدا هەندێک ئامانجی شۆڕش بەدیهێنران. لەسـایەی حوکمڕانیی ناپلیۆنیشـدا،

فەڕەنسا بووە خاوەنی یاسای شارستانی و لەگەڵ کڵێسـا ڕێککەوتننامەی مۆرکرد و لـە فەڕەنسـا بۆ یەکەمین جار بانقێکی نیشـتمانی دامەزرا. هەروەها پلەبەندیی ڕەسمیی پۆستەکانی دەوڵەت، دادگاکان، زانکۆکان، قوتابخانەکان، سوپا، پەروەردە و زۆربەی ئەو پیشانە دانرا، کە بەبێ ئەوان دەوڵەتێکی هاوچەرخ بنیات نانرێت و زۆربەی ئەوانە دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی ناپلیۆنی. واتە بەشێک لەو دامەزراوە نوێیانەی ئامانجی ڕۆشنگەرەکان بوون، چەند ڕژێمێکی دەسەڵاتخوازی دوای شـۆڕش هێناویاننەتە بواری جێبەجێکردنەوە، بەوجۆرەش ئەو ڕژێمانـە بەشـێکیان بەردەوامکردوەو بەشێکی تریان دابڕیوە. بەشـێک لەو بیرۆکانە لەگەڵ بنیاتنانەوەی کۆماری دیموکراتیـدا، پـاش قۆناغی ئیمپراتۆری و هەوڵـدان بۆ نۆژەنکردنەوەی پاشایەتی جێبەجێکرا، بەڵام پێویسـتە باسی ئەوە بکەین کە ڕژێمی ناپلیۆن بەشـێوەیەکی دەسەڵاتخوازانە بەشێک لە بیرۆکەکانی شـۆڕشی جێبەجێکردوە، وەک ڕیفۆرمی کارگێڕی لەسەرەوەڕا، بەشـێکی تریش لە سـەردەمی شـا (لویس فیلیپ)ی نیمچە لیبراڵیدا جێبەجێکراوە.

لەوەبەر نووسەری ئەم کتێبە لە ساڵی ٢٠٠٧دا، واتە پێش شـەپۆلەکانی شـۆڕشـە عەرەبییەکان، نووسیویەتی: «دیموکراسی وەک ئەوەی دەیناسین بەهۆی شۆڕشەکانەوە بنیات نانرێت، بەڵکو لە ڕێگەی

پرۆسەیەکی ڕیفۆرمی درێژخایانەوە ئەنجامدەدرێت. هەندێک جار خودی گۆڕانکارییەکە بەبێ شۆڕش و تەنانەت لە سەرەوە دەستیپێکردوە. زۆر ڕاپەڕینی توندوتیژ دەربارەی چەندین مەسەلەی تر کەوتوونەتە ناو بارودۆخی ڕیفۆرمەوە، یان بوونەتە هۆی دەستپێکردنی ڕیفۆرمی دیموکراتیانە... بەڵام بەدەگمەن دیموکراسی بەیەکجار و لە ڕێگەی تاقە شۆڕشێکەوە بنیاتنراوە، یان لە ڕێگەی شۆڕشێکەوە ئەنجامدراوە کە دیموکراتخوازەکان بەهۆی کودەتاوە دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست. تەنانەت شۆڕشی فەرەنسی لە ساڵی ١٧٨٩دا سیستەمێکی دیموکراتیی کامڵی دانەمەزراند، بەڵکو بە قۆناغی یەعقوبییەکاندا تێپەڕی و هەڵگەڕانەوەکانی ناپلیۆن و پاشەتی بەدوایدا هاتن...» (٣٨). «تەنانەت گریمان توانای «کودەتایەکی دیموکراتی» یان شۆڕشگێڕانە بەمەبەستی سیستەمێکی دیموکراتی لەئارادابێت- کە مەسەلەیەکە بەدەگمەن ڕوودەدات، چونکە پێویستی بە بوونی چەند هێزێکی دیموکراتیخوازی خاوەن ڕێکخستن و هێزی پایەبەرزە- ئەوا ئەوە ئەنجامدانی چەند ڕیفۆرمێکی وردەوردە لەکۆڵ ئەوان ناکاتەوە کە یاریدەدەرن بۆ بنیاتنانی دیموکراسی» (٣٩). شۆڕش بۆ گۆڕینی سیستەم لەو دەوڵەتە ستەمکارەکارانەی ڕیفۆرم ڕەتدەکەنەوە مەرجێکی گرنگە، گۆڕینی

سـیستەم مەرجێکی پێویسـتە، بەڵام بەس نییە، چونکە شـۆڕشی دیموکراتی ئەنجامی تاقـە کارێک، واتە ڕووخاندنی سیستەمی حوکمڕانی، نابێتە مایەی هاتنەدیی دیموکراسی، بەڵکو لە ڕێگەی پرۆسەیەکی ڕیفـۆرم و بنیاتنانی درێژخایانـەوە، پاش گۆڕینی سیستەمەکە، دێتەدی.

## شۆڕشی دیموکراتی و ئایدیۆلۆژی

مێژوو باسی شۆڕشێکی میللیـ یان شۆڕشێک کە سەرکەوتووبووبێ لە میللیبووندا – ناکات، کە لەسەر بنچینەی هێنانەدیی بەرنامەیەکی پێشوەخت داڕێژراو و بەپێی ئایدیۆلۆژیایەکی سیاسیی فکری و بزووتنەوەخوازی ئاشکرا بەرپابووبێ. تەنانەت ئەو شۆڕشانەی بوونەتە هۆی دامەزرانی چەند ڕژێمێکی خاوەن ئایدیۆلۆژیای ڕەسمی، وەک شۆڕشەکانی ڕووسی و ئێرانی و کوبی و ئەوانیتر، کە لەسەرەتادا شۆڕشی دژی زوڵم لێکردن بوون، یان بۆ گۆڕینی سیستەمی حوکمڕانی بوون، یاخود بۆ ڕزگاربوون بوون لە دەستی کۆڵۆنیالیزم و بوونەتە هۆی هاتنەئارای چەند حیزبێکی هەژمونگەر یان هاتنەپێشی ئەو حیزبانەی گۆڕاون بۆ هەژمونگەر. سەرەنجام زاڵبوونی حیزبێک یان بزووتنەوەیەک بەسەر شۆڕشدا پاش کۆتاییهاتنی، یان بەسەر دەسەڵاتدا پاش تەواوبوونی، بۆتە مایەی سەرهەڵدانی ئەو جۆرە سیستەمە. زۆرجار گۆڕانکارییەکە چەند ساڵێک پاش دەسەڵاتگرتنەدەست

ڕووەو ئایدیۆلۆژیای ڕەسمی بووە. ئەمەش بۆ نموونە باری شۆڕشی کوبی بوو، چونکە ئەو شۆڕشە بۆ هێنانەدیی بەرنامەیەکی ئایدیۆلۆژی دەستی پێ نەکرد، بەڵکو دواتر ئەو بەرنامەیە بنیاتنراو تیۆریزەی بۆ کراو بەڕەواکرا بۆ بەخشینی ڕەوایەتیو ماقوڵبوون بە گۆڕان لە نیشتمانییەوە بۆ کۆمۆنیزم، کە پێویستییەکانی گۆڕانی شۆڕش بۆ دەسەڵات سەپاندبوویان. دەکرێت بوترێت، ئەگەر شۆڕشی ڤێتنامی پێشوەخت وەک شۆڕشێک بۆ بنیاتنانی سیستەمێکی حوکمڕانیی کۆمۆنیستانە خۆی ڕابگەیاندایە، ئەوا میللەت بەو شێوە بەناوبانگە بەشداریی تێدا نەدەکرد. ئەو میللەتەی شۆڕشەکەی خۆی کردە نموونەیەک لەناو شۆڕشەکانی گشت وڵاتە هاوشێوەکاندا، لەوانە وڵاتە عەرەبییەکانمان. پێویست ناکات لێرەدا باسی ئەوە بکەین، کە کتێبخانەی شۆڕشگێڕانەی عەرەبی پڕیەتی لە شوبهاندنی شۆڕشی عەرەبی بە شۆڕشی ڤێتنامی لە حەفتاکانی سەدەی پێشوودا.

لە کاتی شۆڕشەکاندا، تەنانەت حیزبە ئایدیۆلۆژییەکان بەتەنگ ئەوەوەن جەغت لەسەر بەرنامەی لایەنی کەم بکەنەوە، کە چەندین توێژی فراوانی میللەت و چەندین هێزی سیاسیو کۆمەڵایەتیی جیاواز کۆدەکاتەوە و هەوڵدەدات بەرنامە تایبەتیەکانی خۆی بشارێتەوە، یان دوایان

بخات هەتاکــو دوای دەسەڵاتگرتنە دەســت بەهۆی شــۆڕشــەوە.

دەشــێت چەندین گۆڕانکاریی ڕووناکبیری و ئایدیۆلۆژی لای چەند توێژێکی فراوانی کۆمەڵگە پێش شۆڕش بکەون. سەختە بەبێ ئەو جۆرە گۆڕانکاریانەی دەبنە هۆی وێناکردنی شێوازی ژیان وەک زوڵمێک کە کەس بەرگەی ناگرێت، وێناکردنی تاکەکان بۆ خودی بە کۆمەڵیان وەک میللەت، بینینی دەســەڵات وەک بارێکی جیا لە دەوڵەت یان بەکاربەری دەوڵەت بۆ خزمەتکردنی بەرژەوەندییە ئۆلیگارشییەکانی تایبەت بەخۆی، یاخود بینینی ئــازادی وەک پێداویستی، پێداویستییەکان وەک داواکاری، دواکارییەکان وەک مافەکان و ئەوانیتر، ســەختە بەبێ هەمــوو ئەوانە باسی فیکرێکی شــۆڕشــگێڕانە یان چەند هاندەرێکی شۆڕشگێڕانە بکرێت. لەلایەکی ترەوە، ناکرێت وێنای ئەوە بکرێت جەماوەری فــراوان خوازیاری ئەوەن، لەســەر بنچینەی ئایدیۆلۆژیای یەکێک لە حیزبەکان، سیستەمی حوکمڕانی دامەزرێنن.

بۆیە شۆڕشە میللیەکان بەسروشتی خۆیان شۆڕشی ئەو حیزبە ئایدیۆلۆژیانە نین کە کۆششدەکەن بۆ دەسەڵاتگرتنەدەست. هەمیشە ئەمجۆرە شۆڕشانە ناتوانن میللــەت لە دەوری خۆیــان کۆبکەنەوە و دەگۆڕێن بۆ شەڕی پارتیزانی، یان شێوازی کودەتای

سەربازی، یاخود هیتر. شۆڕشە میللییەکان، شۆڕشی میللین نەک چەکداری، بەڵام ئەو حیزبانەی دەست بەسەر شۆڕشدا دەگرن، پاش ئەوەی دەیگۆڕن بۆ دەسەڵاتێک، مێژوویەک بۆ شۆڕش دادەڕێژن خاوەن خەسڵەتی فوو لەخۆکردنە و لەسەر بنچینەی ئەفسانەیەک یان وێناکردنێک کە هێما بۆ ئەوە دەکات ئەو حیزبانە سەرکردایەتیی شۆڕشیان کردوە، یان نەدەکرا ئەو شۆڕشە بەبێ ئەوان بەرپابکرێت. لەکاتێکدا هێز و حیزبەکانی تر بەوە تاوانباریان دەکەن، ئەوەی کردوویانە تەنیا دزینی شۆڕش بووە. ئەمانە ئیمڕۆ هەندێک لە هێماکانی شۆڕشی میسرِی پێکدێنن، لەگەڵ ئەوەشدا ڕواڵەتێکی دینامیکیی شۆڕشەکانی هەر شوێنێک پێکدێنن. ئەگەر ئەوە بۆ زۆربەی شۆڕشەکان لە مێژوودا ڕاست بێت، ئەوا بێگومان ڕاستیشە بۆ شۆڕشە دیموکراتیەکان، یان ئەو شۆڕشانەی جەماوەر و هێزە سیاسییەکانیان ڕاشکاوانەو بە زیاتر لە شێوازێک دەریانبڕیوە کە ئامانجیان ڕزگاربوونە لە دەست ستەمکاری و هێنانەدیی سیستەمی دیموکراتییە.

بێگومان گشت شۆڕشەکان ئامانجیان هێنانەدیی دیموکراسی نییە، بەڵام هەموو ئەو شۆڕشە عەرەبیانەی لەماوەی نێوان کانونی یەکەم/دیسەمبەری ٢٠١٠ و سەرەتای تەمموز/ یولیۆی ٢٠١١دا سەریانهەڵدا

- ئەو ماوەیەی ئەم دەقەی تیادا نووسراوە- دروشمی دیموکراسی و دەوڵەتی مەدەنیان بەرزکردۆتەوە. لێرەداو لەم دەقەدا باسی مانای نوێی دەستەواژەی دەوڵەتی مەدەنی (٤٠) ناکەم، چونکە خەڵک لەسەر ئەوە ڕاهاتوون گوێیان لە دەستەواژەی کۆمەڵگەی مەدنی بێت، لەبەرئەوەی شتێکی دەوڵەتی نییە. زۆرجار تیۆریستەکان بیرۆکەی کۆمەڵگەی مەدەنی بەوە لێکدەدەنەوە، کە شتێکە دەوڵەتی، یان ئایینی، یاخود سەربازی نییە. لە باری دەوڵەتی مەدەنیدا ئاوەڵناوەکە مانای دەوڵەتی دیموکراتییە، واتە دەوڵەتێکی دیموکراتیی نائایینی و ناسەربازی. ئایا هەموو ئەوانەی ئەم دروشمە دووبارەدەکەنەوە مەبەستیان لێی ئەو مانایەیە؟ ئایا مەبەستی هەر یەکێک پشتگیریی شۆڕشی کردبێ ئەوە بووە لە بنەڕەتدا بەشداریبکات لە هێنانەدیی دیموکراسیدا بەهۆی ئەوەوە؟

لەوانەیە هاندەرەکانی خەڵک وەک تاکەکان بۆ بەشداریکردن لە ناڕەزاییدەربڕیندا هەمیشە بۆ شیکارەکان ڕوون نەبووبێ، لەوانەیە بێزاریی میللیی کەڵەکەبوو دژی ڕژێمەکان بنچینە بێت. مەبەست لەوەش تورەبوونی کەڵەکەبووە بەهۆی گەندەڵی، بێکاری، هەژاری، فشۆڵیی دڵنیایی کۆمەڵایەتی و مرۆڤانە، دۆزەخبوونی ژیانی ڕۆژانە، نەداریی کۆمەڵایەتی و سیاسی، سوکایەتیپێکردنو سەرپێشۆڕکردنو نەبوونی

ئازادی، خراپ مامەڵەکردنی دامودەزگاکانی ئاسایش لەگەڵا هاوڵاتیان، زەلیلکردنی هاوڵاتی وەک شێوازێکی ئاسایی لە پەیوەندیی نێوان تاکەکانو دامودەزگاکانی دەوڵەتــدا، بڵاوبوونــەوەی دەستوپێوەندخوازی و خزمایەتیکردن لە ئەلفەوە بۆ یا، نەبوونی سەروەری لەکاتی پەیوەندیکردن لەگەڵا دەرەوە ... هتد. چونکە لە ڕوانگەی کۆمەڵناسیانەوە بۆ ئەو گۆڕانکارییە مەزنانەی شۆڕشەکان نوێنەرایەتیان دەکەن، ئەو هۆکارانە - بینراوو نەبینراو پێکەوە- تێکهەڵکێشن و سروشتییە ئەو مەسەلانە بزوێنەری ناڕەزاییەکان بن، بەڵام بێگومان ئەو هەڵوێستە بەرامبەر بە ڕژێمی دەسەڵاتخواز و سەرەنجامەکانی، هەڵویستێکی هەمەلایەن و گشتیو کۆکەرەوەخواز بووە، کاتێک ئەو تورەییە لەســەر شەقامە عەرەبییەکان وەرگێڕدراوە بۆ هەڵوێستێکی سیاسی، بەجۆرێک کە شەقام بۆتە شێوەی زیندووی پشێو و تورەی ڕای گشتیی دوورخراوەو پەراوێزخراو، وەک ئەوەی ڕای گشــتی شــێوەی دامەزراوەیی داواکارییەکانی ناڕەزاکان و مەسەلەکانیان بێت، کاتێک بەشێوەی دەوڵەتێکی دەستوری دادەمەزرێت و ڕێزی مافە مەدەنی و کۆمەڵایەتییەکان بەگشتی دەگرێت. شەقامیش ڕای گشتیی جۆشخواردوو و تورەیە دژی نائامادەیی ڕای گشتی. داواکاریی دیموکراسی لای چەندین توێژی فراوانی دەستپێشکەران و بەشداران

خەملێنەر بووە، ئەوەش لە ڕێگەی کەڵەکەبوونێکی سیاسییەوە، کە لانی کەم سی ساڵا بەردەوامبووە، بەڵام خەملێنەرێکی نێگەتیڤانە بووە - مەبەست بەپێناسەکردنی شتەکەیە بەوەی ڕەتیدەکاتەوە، واتە بەوشەیەکی تر دژی ستەمکاری- لای ئەوانەی کەمتر بەسیاسیکراون و ڕێژەی بەشداربوونیان بەهۆی ڕادەی بەسیاسیکردنەوە کەم نەبۆتەوە. ئەمەش مەسەلەیەکی سروشتییە، چونکە شۆڕشەکان بەپێی بەرنامەیەکی پێشوەخت کارێکی حیزبیی ڕێکخراونین.

لەڕاستیدا شۆڕش، ئەگەر شۆڕشێکی هەمەلایەن بێت و حیزبێک بە بەرنامەیەکی هەمەلایەن و فراوان سەرکردایەتی بکات، زۆربەی جارەکان ستەمکارییەک دەگۆڕێت بۆ ستەمکارییەکی تر و بە زمانی کارل پۆپەر ئەندازەیەکی کۆمەڵایەتیی گشتیی نوێ دەسەپێنێت، کە لەسەر ئاستی هەموو کایە ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان هەڵقوڵاوی بڕواکانی خۆینەو فەزای گشتی بەهۆی چەندین چەکی هەژمونخواز و دامەزراوەیی نوێوە داگیردەکات، کە دەبنە مایەی بەرهەمهێنانەوەی ستەمکاریی کۆن بە شێوازی نوێ. پێویستە باسی ئەوە بکەین، بەتایبەتی بەرامبەر بەو بیرۆکەیەی لەسەرەوە هاتووەو بریتییە لەوەی حیزبەکان لە گشت شۆڕشەکاندا بەرنامە ئایدیۆلۆژییەکانی خۆیان دەرناخەن، هەتاکو بتوانن

بزووتنەوەیەکی جەماوەریی هەمەلایەن بەرپابکەن، بۆ ئەوەی جەماوەری فراوان ڕازیین بەشداریی تیادابکەن، بەڵام پێویستە لەباری شۆڕشی دیموکراتیدا، دەرنەخستنی بەرنامەی ئایدیۆلۆژی ببێتە ستراتیژ نەک تەکتیک، هەتاکو دیموکراسی وەک سیستەم دادەمەزرێت.

حیزبە باوەکان سەرکردایەتیی شۆڕشە عەرەبییەکانیان نەکرد - لەوەوبەر باسی بابەتەکەو هۆکارەکانمان کردوە - بەڵام نابێت خوێنەر لەوە دڵنیابێت، ئەو ئامادەنەبوونە بۆخۆی مەرجێکی بەسە بۆ هێنانەدیی دیموکراسی، چونکە لەوانەیە نەبوونی نەخشەو بەرنامەی سیاسی لە باری هەڵوەشاندنەوەی ڕژێمی حوکمڕاندا، ببێتە هۆی ئەوەی چەند هێزێکی کۆمەڵایەتیی بەسیاسینەکراو بێنە ڕیزی پێشەوەی ژیانی سیاسیو لێک جیابوونەوە و درزتێکەوتنی گەورە لەناو دەوڵەتو کۆمەڵگەدا دروستبکەنو وەک چەند قەوارەیەکی دامەزراوو یەکگرتوو هەڕەشەیان لێ بکەن، بەڵکو لەوانەیە هەرەسهێنانی دەوڵەتو کۆمەڵگە ببێتە هۆی هەڕەشەکردن لە هەرێمەکانی دراوسێ. با وا خەیاڵبکەین کە بە چاویلکەیەکی خەیاڵیی ڕەشەوە دەڕوانین، ئاخۆ بارودۆخی خۆرهەڵاتی عەرەب و کەنداو و دوورگەی عەرەب چۆن دەبێت، لە ئەنجامی تێکچوونی تایەفەگەرانە و عەشایەریو ناوچەگەرانە لەسایەی ئەم بارودۆخەی ئێستادا.

ئامانجی دیموکراسی ڕوونەو ناکرێت لە سفرەوە دەستپێبکرێت، وەک ئەوەی عەرەب شتێکی نوێ داهێنابێت. لانی کەمی ئاشنا بۆ دیاریکردنی ئەوەی هەر ڕژێمێک دیموکراسی بێت یان نا لەئارادایە، بەڵام پرسیارە گەورەکە دەربارەی چۆنییەتی گۆڕانکاریی دیموکراتیانەیە. لێرەدا تایبەتمەندیی هەر وڵاتێک دەردەکەوێت و داهێنانیش ڕاستە. پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لەنێوان شۆڕش و تایبەتێتی و پرۆسەی گۆڕانکاری ڕووەو دیموکراسی لەئارادایە.

بۆ نموونە، ڕوونە ئەو شۆڕشەی پشتبەستووە بە کۆکردنەوەی تایەفەگەرانە یان شوناسخوازانە و بەشێوەیەکی گشتی و لەمیانەیدا کۆمەڵگە بەسەر چەندین شوناسدا دابەشدەبێت، نابێتە مایەی فرەلایەنیی سیاسی و فیکری لە چوارچێوەی کۆمەڵگەدا بەگشتی، بەڵکو کۆمەڵگە دابەشدەبێت بۆ چەندین کۆمەڵگەو زۆریشی پێ ناچێت پارچەپارچەبوونی کۆمەڵگەی سیاسی و ئینجا دابەشبوون بۆ چەند قەوارەیەکی سیاسی یان کۆمەڵایەتیی دژ بەیەک، کە پەیوەندییەکانی ڕق و کینە کۆنترۆڵیاندەکات، تەنانەت ئەگەر لە ڕووی تیۆریشەوە لە چوارچێوەی تاقە قەوارەیەکی سیاسیدا بژین. ئەم بارە لە مێژووی کۆمەڵایەتی و مێژووی نەتەوەکاندا بۆخۆی گرفتی کامڵبوونی کۆمەڵایەتی یان بنیاتنانی نەتەوەیە، کە

ئێمەی عەرەب هێشتا پێی نەگەیشتووین. چونکە دەوڵەتە ناوچەییەکان نەیانتوانی هەڵکشێن بۆ ئاستی چەند دەوڵەتێکی نیشتمانی و توخمێکی پۆزەتیڤانە لە کامڵبوونی عەرەبی لە نەتەوەیەکدا پێکبهێنن، ئەو نەتەوەیەی لە چەند دەوڵەتێکدا دەژی، کەچی بەدەر لەوە ڕایدەگەیەنن ئەوان چەند دەوڵەتێکی عەرەبین و لە چوارچێوەیەکی هەرێمایەتیدا کۆدەبنەوە. چەند مەترسییەکی تریش لەئارادان، وەک ئەوەی کاتی ململانێ لەسەر دەسەڵات مەسەلە ئایدیۆلۆژییەکان لە ڕیزی پێشـــەوە بن. لێرەدا مەبەستمان ئەوە نییـــە حیزبەکان لـــە ڕیـــزی پێشـــەوەن، چونکە دەکرێت ئەم مەسەلەیە لە زۆر باردا خوازراوبێت، بەتایبەتی کاتێک حیزبەکان چەند هێزێکی نوێخواز پێکدێنن و گوزارشت لە چەند هێزێکی سیاسیی ڕاستەقینەی ناو کۆمەڵگە دەکەن و خاوەن وێناکردنی ڕاســـتەقینەی پێشـــبڕکێخوازن و لـــە زیانپێکەوتندا لەلایەن ستەمکارییەوە هاوبەشن. کێشەکە ئەوەیە، ئەو حیزبانە مەســـەلە ئایدیۆلۆژییەکان بهێننە ڕیزی هەرە پێشـــەوە، پاش ئەوەی لە کاتی شـــۆڕشدا شاردبویاننەوە. هەروەها دەشێت چەندین حیزب، کە دوودڵا بوون بەرامبەر بە بەشداریکردن لە شۆڕشدا یان بەکردەوە گرەویان لەسەر نەکردبوو، دەستوبرد پاش ڕووخانی ڕژێم یان تەنانەت کاتی دەرکەوتنی

نیشانەکانی لاوازیی ڕژێم بجولێن، ئەمەش هیچ مەترسییەکی تیادانییەو بارێکە بە ڕادەی جیاواز لە هەردوو دیمەنی شۆڕشی تونس‌و میسرڕدا دەیبینینەوە .

کێشە بنچینەییەکە لەوەدایە، ئەو حیزبانەی هەستدەکەن بەهێزن، ئارەزووی دەربڕینی مەسەلەو هەڵوێستە ئایدیۆلۆژییەکانی خۆیان هەبێت، پێش ئەوەی ڕێساکانی سیستەمی دیموکراسی چەسپیبن. لێرەدا ئەو حیزبانەی خاوەن هێزی کەمترن ترس دایاندەگرێت و داوای چەنـد گەرەنتییەک دەکەن سەبارەت بەوەی ئایدیۆلۆژیای هیچ حیزبێک نەبێتە ئایدیۆلۆژیای دەوڵەت، واتە دامودەزگا و دامەزراوەکانی دەوڵەت گرێ نەدرێنەوە بە فیکرێکی دیاریکراوەوە، جا ئایینی بێت، یان چینایەتی، یاخود هیتر. لێرەدا هەست بە مەترسیی گەڕانەوەی جۆرێکی نوێی سـتەمکاری دەکرێت، کاتێک ئـەو حیزبانە سەرکردایەتیدەکەن ئایدیۆلۆژیای خۆیان لە سـەروو ڕێساکانی گەمەی دیموکراسـییەوە دابنێن و خۆیان بخەنە سەروو دەوڵەتەوەو شۆڕش بۆ بەرژەوەندییە ئایدیۆلۆژییەکانی خۆیان بەکاربەرن. لەکاتی نەبوونی بڕوایەکی میللی دەربارەی ئەوەی شـۆڕشـگێڕەکان لەپێناو دیموکراسـیدا دەرچـوون، تەکانەکـە بەئاڕاسـتەی ئەوە دەڕوات حیزبـەکان ناچاربکرێن مەسەلە ئایدیۆلۆژییەکانی خۆیان دوابخەن

و لەسەر ئەو ڕێسا دیموکراتیانە ڕێکبکەون کە هێزە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانو دامەزراوەکانی دەوڵەت – بەتایبەتی سوپا – بەڵێنی ئەوە بدەن لە هەموو هەلومەرجێکدا و لەکاتی سەرکەوتنی هەر حیزبێک لە هەڵبژاردنەکانی داهاتوودا ڕێزی لێ دەگرن.

حوکمڕانیی نوێنەری زۆرینـــە لە خــولــە هەڵبژاردنەکاندا یەکێکە لە گرنگترین ئەو پرنسیپانە، نەک هەموویان. چونکە زۆرینە بەپێی پرنسیپەکانی دیموکراسی، کە بەدرێژایی مێژوو گەشەیانکردووە و خەڵک ئارەزوویانکردوەو وەک ئەڵتەرناتیڤی ستەمکاری وێنایانکردوە، تەنانەت لە پێناســەی نێگەتیڤەکەیاندا بۆ ســتەمکاری، واتە بەوەی ستەمکاری ڕەتدەکاتەوە، حوکمڕانی دەبەنەڕێوە. ئەمەش پێناســەی سەرجەم میللەتە بۆ ئەڵتەرناتیڤی ستەمکاری، ئەم پرنسیپانەش لەناو چەمکی هاوڵاتیبوونی دیموکراتیــدا هــەن. حوکمدانیش لەسەر بنچینەی پرنسیپی هاوڵاتیبوون، وەک ڕێکخــەری پەیوەنــدیی نێــوان دەوڵەت و دانیشتوانەکەی، وادەکات دەوڵەت مەدەنیانە بێت.

# پەراوێزەکان

١- Arstotle, Politics, Translated by Benjamin Jowett with introduction, Analysis, and Index by H.W.C. Davis, (Dover Publications Inc., Mineola, NY: ٢٠٠٠), P١٨٨.

ئەمەش سەرلەنوێ بڵاوکردنەوەی خودی چاپکراوەکەی ئۆکسفۆرد بوو، کەساڵی ١٩٠٥ بڵاوکراوەتەوە.

٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٩٠.

٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٩٤.

٤- لێرەدا بنچینەی سیاسەتەکانی شۆناس دەبینینەوە.

٥- هێما بۆ ئەوە دەکەین، کە شوناس لە ڕەچەڵەکدا- وەک چەمکێکی فەلسەفی یان لە لۆژیکی شێوەخوازانەدا- مانای یەکسانییەو پێچەوانەی جیاوازیو ناکۆکییە. بە زمانی عەرەبی شوناس مانای ئەو ئەوەیەیە، واتە شت یەکسانە بەخۆی، بەڵام ماناکە لەناو بیرۆکەی ئینتیمادا بۆ کۆمەڵێک وەک شوناس ونبوو، ئەگەرچی بیرۆکەی ئینتیما بۆ کۆمەڵێک مانای بیرۆکەی یەکسانیی کۆمەڵی ئەو تاکانەیە کە ئینتیمایان کردوە بۆ ئەو کۆمەڵە بەوپێیەی ئەوەی کۆیاندەکاتەوە ئەوەیە.

٦- ئەرستۆ ل٢١٦.

٧- حەنە ئارندت: دەربارەی شۆڕش، وەرگێڕانی: عەتا

عەبدولوەهاب، چ١ (بەیروت: ڕێکخراوی عەرەبی بۆ وەرگێڕان، ٢٠٠٨)، ل٨٥-٨٦.

٨ -وەک دەرچوونی گرووپی (التبليغ والدعوة)ی سەردەمەکەمان، کە دەستەواژەی دەرچوون بۆ شەڕکردن یان جیهادیان بەمانایەکی نوێ بەکارهێناوە، واتە پێڕاگەیاندنو بانگهێشتکردن.

٩ - نەیارانی خەوارج بانگەشەی ئەوە دەکەن ئەم ناوەیان بەسەر ئەواندا دابڕیوە، چونکە بانگەشەی دەرچوونیان کردوە لە پێشەوا دادپەروەرەکان، نەک لەبەرئەوەی لە لایەنگرانی عەلی دەرچوونو ڕازی نەبوون بە سەرەنجامی ناوبژیوانیەکەی نێوان عەمرو کوڕی عاس و ئەبی موسای ئەشعەری، بەڵام ئەو خەوارجانەی ناوی خۆیان دەنێن کۆمەڵی ئیمانداران، ئەوا ئەمانە بە شۆڕشەکانیانو قبوڵ نەکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت لە کەنارەکاندا ناسرابوون و بە یاسادانانیان بۆ دەرچوون لەژێر دەسەڵاتی حوکمڕانی زۆردار، هەروەها دەرچوون لە ئیمامی ستەمکاریان بە ٤٠ پیاوی نەناسراو دانابوو، چونکە ئەوە بەسە بۆ شۆڕش بەرپاکردن لە دژیان.

١٠ - مقتبس من: محمد فتحى عثمان، من اصول الفكر الاسلامى: دراسة لحقوق الانسان و لوضع نهاية الدولة والامامة فى ضوء شريعة الاسلام و تراثه التاريخى وافقهى (بيروت: مؤسسة الرسالة، ١٩٨٤)، ص٤٣٨.

١١ - نقلها عنه ابو يعلى الفراء فى كتابه

المعاصر لكتاب الماوردى والذى اخذ عنه الكثير عدا كثرة الاشارة الى الحنابلة: ابو يعلى محمد بن الحسين الفراء الحنبلى، الاحكام السلطانية، صححه وعلق عليه محمد حامد الفقى، (بيروت: منشورات محمد بيضون لنشر كتب السنة والجماعة، دار الكتب العلمية، لا تاريخ)، ص٢٠. و يقول ابو يعلى فى الصفحة نفسها ان ابن حنبل قال ايضا امورا معاكسة.

**١٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤.**

**١٣- بۆ چارەسەركردنی ئەم بابەتە بڕوانە:**

حاكم المطيرى: دراسة موضوعية للخطاب السياسى الشرعى و مراحله التاريخية، ط٢، (عمان: المؤسسة العربية للدراسة والنشر، ٢٠٠٨)، ص١٦٣-١٦٤.

١٤ - شيخ الاسلام ابو العباس احمد ابن تيميه، «مختصر منهاج السنة»، اختصره الشيخ عبدالله الغنيمان، الجزء الاول (المدينة المنورة، ١٤١٠هـ)، ص٧٤-٧٥. موجود على موقع ابن تيميه: (http://www.ibntaimiah.com/index.php?pg=books&ban=٣).

١٥ - احمد ابن تيميه، مجموع الفتاوى، جمع وترتيب: عبدالرحمن بن محمد بن قاسم، ج٤، (المدينة المنورة: مجمع الملك فهد لطباعة المصحف الشريف، ١٤٢٥هـ/٢٠٠٤م) ص ٤٥٠-٤٥٢).

١٦ - عبدالرحمن بن محمد بن قاسم: الدرر السنية فى الاجوبة النجدية: مجموعة رسائل ومسائل علماء نجد الاعلام من عصر الشيخ محمد بن عبدالوهاب الى عصرنا هذا، ج١، ط٦، ١٤٦٧هـ/١٩٩٦م، ص٣٣.

**١٧- با ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٤٨ لە عیراق بێنینەوە کە بە «وثبـة - پڕدان» ناونرا.**

١٨ - توفيق الحكيم، ثورة الشباب، (القاهرة: مكتبة مصر، ١٩٨٨)، ص ١١.

١٩ - عن التمييز بين «العامية» و «القومة» ونمذجة ذلك ب «قومة حلب» قارن مع: عبدالكريم غرابية، «سورية: القرن التاسع عشر ١٨٤٠-١٨٧٦» (محاضرات)، (القاهرة: معهد الدراسات العربية العالية، ١٩٦١-١٩٦٢)، ص ٨٢-٨٦.

٢٠ - عبدالله العروى، مجمل تاريخ المغرب، (الدار البيضاء - بيروت: المركز الثقافى العربى، ٢٠٠٧)، ص ٦٠٢.

٢١ - C.Brinton, Anatomy of Revolution, (NY: Vintage Books, ١٩٩٥) pp ٢٧٥, ٢٨٥.

C.J Friedrich, Revolution, (NY:Atherton, ١٩٦٦), pp٤, ٣٧, ١٢٤.

**٢٢- حەنە ئارندت، ل٢٧.**

**٢٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨.**

٢٤ - ايريك هوبزباوم، عصر الثورة: اوروبا ١٧٨٩- ١٨٤٨، ترجمة: فايز صباغ، ط٢، (بيروت: المنظمة العربية للترجمة، ٢٠٠٨)، ص ٧١.

٢٥- Thomas S. Kuhn, The Structure of Scientific Rvolution, ٣rd Edition.(Chicago and London: The University of Chicago Press, ١٩٩٦), pp ٩٢-٩٤.

**٢٦- حەنە ئارندت، ل٤٧.**

**٢٧- بڕوانە پێشەکیی چاپی ١٩٨٨ی کتێبی:**

Symour Martin Lipset, Revolution and Counter:
Change and Persistence in social Structuers, (New
.(١٩٨٨ , Brunswick&Oxford: Transaction Book

**٢٨- حەنە ئارندت، ل١٣١.**

Lenin, The Collapse of the Social - ٢٩
Moscow:) International, in: Collected Works, vol٢١
.p٢١٣ , (١٩٦٥ , Progress

**هەروەها بڕوانە گرنگیی قەیرانی بورژوازییەت و چینە حوکمڕانەکان:**

Lenin, Left Wing Communism, (Moscow:
.p٦٩ , (١٩٥٠ , Progress

٣٠ - عاصم الدسوقى واخرون، الثورة والتغيير فى الوطن العربى عبر العصور: اعمال ندوة الجمعية المصرية للدراسات التاريخية (القاهرة: مركز البحوث والدراسات الاجتماعية فى كلية الاداب-جامعة القاهرة، ٢٠٠٥)، ص١٦-١٧.

**٣١- اريک هوبزباوم، ل٢٢٠.**

**٣٢- اريک هوبزباوم، ل٢٢٧.**

**٣٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢١.**

**٣٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو.**

**٣٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢٢-٢٢٣.**

**٣٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢٤.**

**٣٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٨.**

٣٨ - عزمى بشارة: المسألة العربية: مقدمة لبيان ديموقراطى عربى، ط١، (بيروت: مركز دراسات الوحدة العربية، ٢٠٠٧)، ص٢٢٦.

٣٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣١-٢٣٢.

٤٠- کاتێک هاوواتایی لەنێوان دیموکراسی و مەدەنیەت و مافە مەدەنیو دیموکراتیەکان کێشمەکێشە ئلیدیۆلۆژیو تەنانەت بڕواخوازییە خاوەن لایەنی دەسەڵاتخوازیی تێدەپەڕێنێ، ئەوا ئەوەی دەشێت دەسەڵاتخوازبێت بە ڕواڵەتێکی ئایدیۆلۆژیی سەرنجڕاکێشی قبوڵکراو بچێتەدەرێ. ئەمەش ئەو شتەیە کە کێشمەکێشەکان قورستردەکات لەسەر ناوەڕۆک ڕاڤەکاری و ئەرکەکانی لە دووڕیانی شۆڕشی میسریی ئەمڕۆدا کە پڕە لە ئەگەرەکان و لە ڕێگەی چەمکی دەوڵەتی ئیسلامیی مەدەنییەوە، لەکاتێکدا هەر دەوڵەتێک بەرژەوەندییەکانی خەڵک دەستەبەربکات ئەوە لە ناوەڕۆکدا مەبەستەکانی شەریعەتی پێکاوە، کە لە هەمان کاتدا هەموو مەبەستە مەدەنییەکانیشە، واتە دەوڵەتێکی ئیسلامییە بەبێ ئەوەی خۆی وا ناوزەندبکات. ئەمەش پارادۆکسە دڵتەزێنەکەی مامۆستا محەمەد عەبدەیە کاتێک لە فەڕەنسا ئیسلامێکی بێ موسڵمانانی دۆزییەوەو لە میسرپیش موسڵمانانی بێ ئیسلامی دۆزییەوە. بەبێ چوونە ناو مشتومڕێکی درێژە سەبارەت بەوە، بزووتنەوە ئیسلامییەکانی ئێستا، بەتایبەتی لە میسر، هێشتا ناگەنە ئاستی وزەی مەدەنیانەی قوڵ لە ئیسلامدا، لە ڕووی ئایینو ژیوارو کۆمەڵایەتییەوە، ئەوەش مەبەستە شەرعییەکانەو تێگەیشتنە لە دەوڵەت لەبەر ڕۆشنایی ئەو مەبەستانەدا. چونکە ئیسلامیبوونی دەوڵەت لەوەدا نییە خۆی بەو ناوەوە ڕابگەیەنێ، بەڵکو لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانیدایە، واتە مەبەستە ئیسلامییە گشتییە مەزنەکانە. ئەمەش ئەوە لێکدەداتەوە کە ئەو دەوڵەتانەی ئیسلامیبوونی خۆیان ڕادەگەیەنن دەوڵەتانێکن کەمتر ئیسلامین، بەمانا جەوهەرییەکەی لە مەبەستە گشتییە باڵاکانی ئیسلامدا.

# سەرچاوەکان

## به عەرەبی


١- ابن تيمية. أحمد، **مجموع الفتاوى**، جمع وترتيب عبد الرحمن بن محمد بن قاسم، ج٤، (المدينة المنورة: مجمع الملك فهد لطباعة المصحف الشريف، ١٤٢٥هـ/ ٢٠٠٤م).

٢- ابن تيمية. أحمد، **مختصر منهاج السنة**، اختصره الشيخ عبد الله الغنيمان، الجزء الأول، (المدينة المنورة: ١٤١٠هـ).

٣- أرندت. حنة، **في الثورة**، ترجمة: عبد الوهاب. عطا، ط١، (بيروت: المنظمة العربية للترجمة، ٢٠٠٨).

٤- بشارة. عزمي، **المسألة العربية: مقدمة لبيان ديمقراطي عربي**، ط١، (بيروت: مركز دراسات الوحدة العربية، ٢٠٠٧).

٥- ابن محمد بن قاسم. عبد الرحمن، **الدرر السنية في الأجوبة النجدية: مجموعة رسائل ومسائل علماء نجد الأعلام من عصر الشيخ محمد بن عبد الوهاب إلى عصرنا هذا**، ج١، ط٦، (١٤٦٧هـ/ ١٩٩٦م).

٦- الحكيم. توفيق، **ثورة الشباب**، (القاهرة: مكتبة مصر، ١٩٨٨).

٧- دسوقي. عاصم، وآخرون، **الثورة والتغيير في الوطن العربي عبر العصور: أعمال ندوة الجمعية المصرية للدراسات التاريخية**، (القاهرة: مركز البحوث والدراسات الاجتماعية في كلية الآداب - جامعة القاهرة، ٢٠٠٥).

٨- العروي. عبد الله، **مجمل تاريخ المغرب**، (الدار البيضاء - بيروت: المركز الثقافي العربي، ٢٠٠٧).

٩- غرايبة. عبد الكريم، «سورية: القرن التاسع عشر ١٨٤٠ - ١٨٧٦» (محاضرات)، (القاهرة: معهد الدراسات العربية العالية، ١٩٦١ - ١٩٦٢)، ص ٨٢ - ٨٦.

١٠- فتحي عثمان. محمد، **من أصول الفكر الإسلامي: دراسة لحقوق الإنسان ولوضع نهاية الدولة والإمامة في ضوء شريعة الإسلام وتراثه التاريخي والفقهي**، (بيروت: مؤسسة الرسالة، ١٩٨٤).

١١- الفراء الحنبلي. أبو يعلى محمد بن الحسين، **الأحكام السلطانية**، صححه وعلق عليه الفقي. محمد حامد، (بيروت: منشورات محمد علي بيضون لنشر كتب السنة والجماعة، دار الكتب العلمية، لا تاريخ).

١٢- المطيري. حاكم، **الحرية أو الطوفان: دراسة موضوعية للخطاب السياسي الشرعي ومراحله التاريخية**، ط٢، (عمان: المؤسسة العربية للدراسات والنشر، ٢٠٠٨).

١٣- هوبزباوم. إيريك، **عصر الثورة: أوروبا ١٧٨٩ - ١٨٤٨**، ترجمة: فايز صياغ، ط٢، (بيروت: المنظمة العربية للترجمة، ٢٠٠٨).

## بە ئینگلیزی

1. Aristotle, *Politics*, Translated by Benjamin Jowett with introduction, Analysis, and Index by H.W. C. Davis, (Dover Publications Inc., Mineola, NY: 2000).
2. Brinton. C., *Anatomy of Revolution*, (NY: Vintage Books: 1995).
3. Friedrich. C. J., *Revolution*, (NY: Atherton, 1966).
4. Kuhn. Thomas S., *The Structure of Scientific Revolutions*, 3rd Edition. (Chicago and London: The University of Chicago Press, 1996).
5. Lenin, *Left Wing Communism*, (Moscow: Progress, 1950).
6. Lenin, «The Collapse of the Second International», in: *Collected Works*, vol. 21 (Moscow: Progress, 1965).
7. Martin Lipset. Symour, *Revolution and Counter: Change and Persistence in Social Structures*, (New Brunswick&Oxford: Transaction Books, 1988).

# زنجیرە کتێبی گیرفانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

| ناوی کتێب | نووسینی | وەرگێڕانی |
| --- | --- | --- |
| ١–ژن لە شیعر و ژیانی مندا | نزار قەبانی | جەمال غەمبار |
| ٢–نیچە | پۆڵ ستراتێرن | ئازاد بەرزنجی |
| ٣–سوڕی مانگانەی ژن | مارتن لۆدڤیك | ئەکرەم قەرەداغی |
| ٤–دیکارت | پۆڵ ستراتێرن | ڕەئوف بێگەرد |
| ٥–بیری ئاینی کۆن لە ... | د. تەقی دەباغ | یاسین عومەر |
| ٦–ڕێبازەکانی ڕەخنەی ئەدەبی | دیایینی. دەچز. ئبرامز | عەتا قەرەداداخی |
| ٧–ئایین و کەسایەتی | ل. پاڵس | ئاوات ئەحمەد |
| ٨–هەشت نامە | گۆنتـــــــەرگراس– کینزابۆرۆئۆ | شۆڕش جوانڕۆیی |
| ٩–ئانارشیزم | د. مستەفا ڕەحیمی | ڕێباز مستەفا |
| ١٠–کۆمارە کوردییەکەی مەهاباد | ئارچی ڕۆزفڵت | ئەکرەم قەرەداخی |
| ١١–دەربارەی دیالێکتیکی.. | موراد فەرهاد پوور | بەختیار سەجادی |
| ١٢–پۆزش | ئەفلاتون | ئاوات ئەحمەد |
| ١٣–ئاوابوونی هزرە تۆباوییەکان | ئایزایا بەرلین | کامیا محەمەد |
| ١٤–هونەری نیگارکێشان.. | شمیدت دیجینەر | وەهبی ڕەسوڵ |
| ١٥–چامەی پەخشان | سۆزان بیرنار | سەلاح محەمەد |
| ١٦–ئایین، عەلمانییەت.. | محەمەد ئەرکۆن | شوان ئەحمەد |
| ١٧–سارتەر | پۆڵ ستراتێرن | ئازاد بەرزنجی |
| ١٨–چۆن دەبیت بە باشترین هاوڕێی خۆت | میلدرید نیومان بێرنارد بێرکۆتس | شێرزاد حەسەن |
| ١٩–کورد و زمانی کوردی | تۆفیق وەهبی | عەزیزگەردی |
| ٢٠–ئەنتۆنین ئارتۆ و شانۆی | جەلال ستاری | پێشڕەو حسێن |
| ٢١–پاسکاڵ | ئاندرێ کریسۆن | سامان عەلی |
| ٢٢–کافکا | سادقی هیدایەت یوسف حاجی میرزا | محەمەد کەریم |
| ٢٣–لە نێوان بلیمەت و شێتیدا | هاشم ساڵح | نەوزاد ئەحمەد |
| ٢٤–مرۆڤ لە ڕوانگەی فرۆیدەوە | قاسم حسێن ساڵح | عەبدولموتەلیب عەبدوڵلا |
| ٢٥–جیهانی ئیمپریشێنیزم | هانز خافێ | ئیسماعیل حەمەئەمین حەمەی ئەحمەد ڕەسوڵ |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٦-لە "نیویۆرگ"ەوە تا "كابول" | یوسف ئەبازەری | مەنسور تەیفووری |
| | موراد فەرهاد پوور | فەرهاد ئەمین پوور |
| ٢٧-مۆدێرنە و ڕاسیزم | جۆرج تەرابیشی | شوان ئەحمەد |
| ٢٨-پاش بونیادگەری | تێری ئیگلتۆن | سەلاح حەسەن |
| ٢٩-فەلسەفەی خۆراوایی | | ئاوات ئەحمەد |
| ٣٠-مۆدێرنە و پۆست مۆدێرنە | پیتەر كریستو | شۆڕش جوانڕۆیی |
| ٣١-فەلسەفەی ناتوندوتیژی | دیڤید مەكرینۆڵدز | كامیل محەمەد قەرەداغی |
| ٣٢-شێرە كولەی ئاسنین | سەلیم بەرەكات | عیسا چیایی |
| ٣٣-جیهانی سێیەم و گەران.. | | د. هیمدادی حوسێن |
| ٣٤-فەرهەنگی فیلمۆگرافیك | یون كارنبێرگ | ئاوات عەبدوڵڵا |
| ٣٥-بەرگریكردن لە ڕۆشنبیران | ژان پۆڵ سارتەر | دلاوەر عەبدوڵڵا |
| ٣٦-چۆن ڕۆمان دەنووسرێ؟ | گابریل گارسیا ماركیز | ڕەووف بێگەرد |
| ٣٧-كورتەیەك لە بارەی ... | لین ئۆلنبیرند- لیزلی لویس | سەلاح عومەر |
| ٣٨-كیركەگۆر | پۆڵ ستراتێرن | ئازاد بەرزنجی |
| ٣٩-ئینتەرنێت | ناتق الخلوصی | ئەكرەم قەرەداخی |
| ٤٠-فەرهەنگی سۆفیا | ئۆتە بیوهمە | بەهرۆز حەسەن |
| ٤١-دیاردەی گەندەڵی | د. ناسر عوبەید ئەلناسر | هەڵكەوت عەبدوڵڵا |
| ٤٢-بێگومان، تۆ ئەتوانیت! | لاش- ئێریك ئونیستۆڵ | عەبدوڵڵا تۆفیق |
| ٤٣-نیچە | | شوان ئەحمەد |
| ٤٤-گوڵی بیابان | واریس دیری | زۆراب |
| ٤٥-هونەری نواندن | ریچارد بۆلسلافسكی | نەجمەدین ئەسعەد |
| ٤٦-جیمس جۆیس | ج. ئی. م. ئستێوارت | عەتا نەهایی |
| ٤٧-بایەكانی كوردستان | د. محەمەد موكری | د. موحسین ئەحمەد |
| ٤٨-كاریگەری گۆرانی ..... | میشێل لیزینبێرگ | عەزیز گەردی |
| ٤٩- شیكردنەوەی دەروونی | تیری ئیگلتۆن | سەلاح حەسەن |
| ٥٠- شانۆی ڕەش | ئەسگەر هولگۆو | ئازاد مەولود |
| ٥١-كازانتزاكیس | یۆرگۆس ستاسیناكیس | ئازاد بەرزنجی |
| ٥٢-بونگەرایی فەلسەفەی مرۆڤایەتیە | جان پۆل سارتەر | ڕۆشنا ئەحمەد |
| ٥٣-كتێبی پرسیارەكان | د.گریگۆری شتۆك | زانیار فایەق سەعید |
| ٥٤-دەروازەیەك بۆ هزرنامەی لویس ئەلتۆسێر | برتراند ئوجیلفی | سابیر ڕەشید |

| | | |
|---|---|---|
| ٥٥- مرۆڤ ئازادیی خۆی فرۆشتووە | کریشنا مۆرتی | یاسین عومەر |
| ٥٦-میدیای ئینتەرنێتی و گرفتە یاساییەکانی | سامان فەوزی | هونەر ڕەسوڵ |
| ٥٧-شانۆی فەرەنسی | ئەندرێ لاگارد-لۆرانت میچارد | جەلال حەمید |
| ٥٨-شیعری قەرەج | هانزیکون فویکت | هەورامان وریا قانیع |
| ٥٩- ١٨سەعات لە ژیانی مستەر بلووم بە (٥٤) دەقیقە..! | جیمس جۆیس | مەحمود زامدار |
| ٦٠-تیرۆریزم | بروس هۆفمان | ئاوات ئەحمەد |
| ٦١-ساموویێل بیکیت | | شۆڕش محەمەد حسێن |
| ٦٢-دەروازەی خۆناسین | | هەڵکەوت عەبدوڵلا |
| ٦٣-سۆسیۆلۆژیا لای کارل مارکس و ماکس ڤێبەر | د.ئیحسان محەمەد ئەلحەسەن | دانا مەلا حەسەن |
| ٦٤- دەروازەی ڕۆژنامە نووسی | ڕەزا حاجی ئابادی | کارزان محەمەد |
| ٦٥-ژیاننامەی گەورە موزیسیانەکان | ئەبیان ودوارد | زۆزک قەرەداغی |
| ٦٦-ئیسلام و گلۆبالیزم | د.محەمەد ئارکۆن | نەوزاد ئەحمەد |
| ٦٧-لە ژێر ئاسمانی شیعردا | | عیسا چیایی |
| ٦٨-فەیلەسوفی هۆڵی هەشتەم | هاشم ساڵح | هەڵکەوت عەبدوڵلا |
| ٦٩-بنچینەکانی وەرگێران | کۆمەڵێ نووسەر | قادر وریا |
| ٧٠- دریدا ، ڕەخنە لە .... | | عەبدولموتەلیب عەبدوڵلا |
| ٧١-گفتوگۆیەک لەگەڵ هایدیگەردا | | د.محەمەد کەمال |
| ٧٢-ئەنترۆپۆلۆجیای پزیشکی | د.مەجید حەمید عارف | غازی عاصی محەمەد |
| ٧٣-جگەرەکێشان | د.عادل هادی | دڵنیا عەبدوڵلا |
| ٧٤-عەلمانییەت و ئسوڵیەت | عەفیف ئەخزەر | شوان ئەحمەد |
| ٧٥-نیتشەو فێمینیزمی هاوچەرخ | نوشین شاهندە | محمد کەریم |
| ٧٦-ئەنشتاین | پۆل ستراتێرن | صەباحی مەلا عەولا |
| ٧٧- ڕەهەندە مرۆییەکان لە موزیکی بتهۆڤندا | غانم ئەلدباغ | زۆزک قەرەداغی |
| ٧٨- میتۆدی دیالکتیکی...... | د. زەکەریا ئیبراهیم | سامان عەلی حامید |
| ٧٩- پەککەوتنی سێکسی.... | د.لەیلا قەدوح | ئەکرەم قەرەداخی |
| ٨٠- ڕێبازەکانی ڕەخنە | ئایان ماکلین | عەتا قەرەداخی |
| ٨١-بەرگریکردن لە مافەکانی ژن | ماری ولستونکرافت | سۆزان جەمال |
| ٨٢-ئەنترۆپۆلۆژیا چییە؟ | د.قەیس ئەلنوری | سۆران قادر |
| ٨٣-مافە مەدەنییەکان | ئەندرۆ ئۆڵتمان | ئومێد فایەق قەرەداغی |

| | | |
|---|---|---|
| ٨٤–هەواڵ و هەواڵ نووسین | د.یونس شوکرخوا<br>د.حسێن قەندی<br>د.نەعیم یەدیعی | کارزان محەمەد |
| ٨٥–پیکاسۆ | گێرترۆد ستێین | زاگرۆس زەردەشتی |
| ٨٦–ئاشنابوون بە فیمینیزم | | عەزیز رەئووف |
| ٨٧–دیموکراسی و کۆمەڵگەی شلرستانی | سەنا فوئاد عەبدوڵلاّ<br>بورهان غلیون | هەڵکەوت عەبدوڵلا |
| ٨٨–رەخنەو حەقیقەت | رۆلان بارت | پێشرەو حسێن |
| ٨٩–عەقڵی شیعری | خەزعەل ئەلماجدی | عەبدولموتەلیب عەبدوڵلاّ |
| ٩٠–رەگ و ریشەکانی ناسیۆنالیزمی تورکی | د.قەیس جەواد ئەلعەزاوی | د.موحسین ئەحمەد عومەر |
| ٩١–وەرزێك لە دۆزەخ | ئارسەر رامبۆ | کەریم دەشتی |
| ٩٢–ئیمەی ژنان | ئیدێس سوێدێگران | عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم |
| ٩٣– پۆل ریکۆر | | ئەحمەد رەزا |
| ٩٤– دیموکراسی | فالح عەبدولجەبار | کامیل محەمەد قەرەداخی |
| ٩٥–جۆرج تەرابیشی | هاشم سالح | شوان ئەحمەد |
| ٩٦–غەزەلی غەزەلەکانی سولەیمان | | بەیان عەزیزی |
| ٩٧–ماکیاڤێللی و ماکیاڤێللیزم | د. رامین جهانبگلو | نەوید مێهراوەر |
| ٩٨–ژن و توندوتیژی | | کنێر عەبدوڵلاّ |
| ٩٩–رۆمان و واقیع | | سەلاّح عومەر |
| ١٠٠–رۆژنامەوانی ئەلکترۆنی | د.نەعیم بەدیعی | کارزان محەمەد |
| ١٠١–هاوسەرگیری بە زۆر یان ..... | | هاودەم حەمە سالح |
| ١٠٢–ئیبن خەلدون و ئۆگست کۆنت | د.ئیحسان محەمەد | دانا مەلا حەسەن |
| ١٠٣– ژن ، دەق ، فەتوا ....... | | عەزیز رەووف |
| ١٠٤– عێراق و کورد | | د. عەباس مستەفا |
| ١٠٥– نوێکردنەوەی ئەقڵی عەرەبی | ئەدۆنیس | نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد |
| ١٠٦– ئێمەو مۆدێرنیتە | داریوش ئاشووری | فەرشید شەریفی |
| ١٠٧–تورگنیف ئیڤان سەرگیڤیچ | | ئیبراهیم ئەحمەد حسێن |
| ١٠٨–توندوتیژی دژی ژنان ، میسر، ئەردەن، سوریا ، لوبنان، فەلەستین | د. هیفاء ابو غزاله | کنێر عەبدوڵلاّ |
| ١٠٩– دیـوی نـاوەوەی خەیاڵەکانی سەددام | | د.عەباس مستەفا |

| | | |
|---|---|---|
| ١١٠–له گاسنەوە بۆ کۆمپیوتەر | | محەمەد حەمە ساڵح تۆفیق |
| ١١١– توێژینـــەوەی ســـایکۆلۆژی لـــە داهێنانی شیعردا | | حەمەی ئەحمەد ڕەسوڵ |
| ١١٢–بنــــــچینەو بەنــــــماکانی دیموکراسی | | ڕەحمان ئەمیری |
| ١١٣–کۆمـــــەڵگا ڕۆشــــــنگەری توندوتیژی | | هەورامان وریا قانیع |
| ١١٤– گۆگۆل | حەمە کەریم عارف | |
| ١١٥—ــ ڕۆمانە نەمرەکان | شۆڕش محەمەد ئەمین | |
| ١١٦– گێڕانەوەیـــەکی شـــیعری لـــە بەندیخانەی پشووەوە | پاولۆ کۆیلۆ | هیوا قادر |
| ١١٧–چۆن سیناریۆ دەنوسیتەوە؟ | ئەلێکسەندەر ئەسترێمسکی | ئازاد کەرکوکی |
| ١١٨–ســـەرەتاکانی دەروونناســـی و پەروەردەناسی | | حەمەی ئەحمەد ڕەسوڵ |
| ١١٩–سوڵتان | شاکر نابلوس | هەڵکەوت عەبدوڵڵا |
| ١٢٠– لـــەبارەی چـــەمکی دەوڵـــەتی مەدەنییەوە | هاشم ساڵح | ئەردەلان عەبدوڵڵا |
| ١٢١–مایاکۆڤسکی | د. حەیات شەرارە | ئیبراهیم ئەحمەد حسێن |
| ١٢٢– نووسین بۆ تەلەفزیۆن | پەیمانگەی (BBC) بۆ ڕۆژنامەوانی | فاروق جەمیل کەریم |
| ١٢٣–چایکۆفسکی | حەمە کەریم عارف | |